# فەرهەنگی

# شاسوار

سەرجەم ئەو وشانەی گرتۆتە خۆی کە

سیامەند شاسواری

لە شیعر و نووسین و وەرگێڕانەکانیدا بەکاری هێناوە

The a KING

# کەلیدەر



فەرهەنگۆك




ئەسپەندەر




ژیگ






بزنمژە




پەردەنیگار




تەختی دێو




ناوگۆزك






تاوڵەمە




سەمەنی




قەقنەس




هێمای
دەستی ئوبولفەزل




تاغ




قورسی



# فەرهـەنگی

# شاسوار

فەرهەنگی ئەو وشە و پەراێزانەی

سیامەند شاسواری

لە شیعر و نووسین و وەرگێڕانەکانیدا

بەکاری هێناوە

## سـیامەند شاسواری




٢٠١١

# هێمـــــا:

☜ بڕوانه

ف فارسی

ع عەرەبی

:: نموونه

**گەڕان بە دوای وشەدا:**

هەموو پیتێک وەک بەشێک کۆدی هەیە لە گەڕان بنووسە:

b و ئینتر لێبدە دەسبەجێ بۆت ئەدۆزێتەوە یان

یان s ئەچێت بۆ بەشی س

یان r ئەچی بۆ پیتی ر و هتد.







**لەپەسا:** بەردەوام.

**لەتردان:** ڕەتڵدان، سەرسمدان.

**لەخت:** بەدەن، لەش، ئەندامانی لەش بە تێکڕایی.

**لـە گۆ کەوتن:** لاڵ بوون، لە قسە کەوتن،




**لاپر:** نەناس، بێگانە.



**ئاپۆرە:** خەڵکێکی زۆر و زەبەند پێکەوە، حەشامات.

**ئاتاج:** نیازمەند، هەژار و نەدار.

**ئاتەگ:** داوێنی کەوای شۆڕ و پاڵتاو.

**ئاخوێرک:** ئاخرکە، پێشکە، مێشوولەی ورد ▭ اخکووک.

**ئاران:** گەرمێن، قشلاق.

**ئارختک:** مۆتەکە، شەوە.

**ئارمور:** Armor ئەمازەیە بە کەناری بریتنی کە لە زمانی سێلتیک بە واتای کەناری زەریا و کۆتایی دنیاشە.

**ئاریستاوس:** Aristaeus یان Aristée، کوڕی سیرن، وەک ڤێرژیل ئەڵێ ڕۆژێک لە کەنار چەمێک ئەکەوێتە دوای ئۆریدۆس. مارێک ئەدا بە ئۆریدۆسەوە و ئەیکوژێ. خواکان لەوە تووڕە ئەبن و بۆ تەمێکردنی ئاریستۆس کە هەنگداری لە ئارکادی کردبوو بە باو، هەموو هەنگەکانی نەخۆش ئەخەن. ئاریستۆس بۆ داوای یارمەتی لە دایکی، کە پەری دەریاییە، لە چەمێکدا خۆی ئەخنکێنێ.

**ئاژان:** جەندرمە.

**ئاژۆ:** ئالیک، تفاق.

**ئاژەڵ:** چوارپێی نزم، مەڕ و بزن و میهـ و بەران و قۆچ :: ئاژاڵ و پاتاڵ: چوارپێی نزم و بەرز.

**ئاستەم:** دژوار و هەڵەمووت.

**ئاستەنگ:** جێگەی سەخت و دژوار و هەڵەمووت.

**ئاسیمە:** پەرێشان، شەڵەژاو، هەراسان :: سەراسیمە.

**ئاغە:** خاوەن گوند؛ لە پێش ناوی پیاوەوە

دێ بە واتەی کابرا، کاکە.

**ئاغەڵ:** گەوڕی زستانەی ئاژەڵ.

**ئافراندن:** بنمیچی نوێژگەی کلیسای سیستین sistine chapel، کە بە دەستی پەروەردگار ڕووناکیی لە تاریکی جیائەبێتەوە و ئافراندنی جیهان و پیاو و ژن و جیابوونەوەی ئاو و وشکی پیشان دراوە. میکل ئانژ کێشاویتی.

**ئاکار:** ڕخوو، ڕەوشت، کردەوە، ڕۆتین ع ف خاصیت، صفت، طبیعت.

**ئاکام:** دوماهی، پاشینە، بەرەنجام.

**ئاگرە:** بایەکی گەرم کە بۆ کشتوکاڵ خراپە.

**ئافەتە:** دانکە، بزەباقە، بزن مەرگی.

**ئالیڤی:** Ludovic Halévy (١٨٣٤-١٩٠٨) نووسەری دەقی ئۆپێراکانی ژاک ئۆفێنباخ Jacques Offenbach بوو. پرووست بە نموونەی وێژەی ڕووکەش بەڵام بە ڕواڵەت پرشنگداری ئەزانێ.

**ئالیک:** ئازۆ، پێخۆری ئاژەڵان.

**ئالایی:** وەک ئاڵا، ئەو پارچە قوماش و پەڕۆیەی ئەدرێ بە سەر خزنی پیر و شێخان دا یان لە داری پیرۆز گرێ ئەدرێ.

**ئالبریخت دوورێر:** Albrecht Dûrer (١٤٤١-١٥٢٨) شێوەکار و هەڵکۆڵەری ئاڵمانی.

**ئالپاکا:** alpaca، ئاژەڵێکی بچووکی وەکوو مەڕە.

**ئالفرێد دو ڤینی:** Alfred de Vigny (١٧٩٧-١٨٦٣) هۆنەر و ڕۆماننوس و شانۆگەری فەڕانسەیی، پەرتووکی یاداشتەکانی شاعیرێک Journal d›un Poète بەرهەمی ئەوە.

**ئالۆش:** خورین، خورکەی لەش:: ئالۆشی هەیە: ژنێک کە حەزی لە پیاو بێ:: ئالۆشی گرتووە: هەوەسی جوولاوە.

**ئالەت:** بیباری هاڕاوی تیژ؛ گیایەکی گەرمیانییە بەرێک ئەگرێ دەنکەکەی ڕەش و خڕ و تیژ و توندە، ئەکرێتە ناو هێندێ خواردەمەنیەوە.

**ئامازە:** سەرەڕا، سەرباری ئەوەی، زیادە لەوە :: ئەمازە: هێما، ئیشارە :: من ئەمزانی، ئامازەی ئەوەش، ئەو هێشتا ئەمازەی بەوە نەدابوو کە خۆشی ئەوێم.

**ئاماڵ:** مەیلەو...، لە ڕەنگی :: ئاماڵ ڕەش: مەیلەوڕەش.

**ئامۆ:** ئاشنا :: ئامۆ و نامۆ.

**ئاموور:** هەوجاڕ، داری مابەینی نیر و دەندە.

**ئاندرۆمەد:** Andromeda لە میسۆلۆژی یۆنانی کچی کفیۆس و کاسیۆیە، دایکی ئەڵێ کچی من لە پەریانی زەریا جوانترە، سکاڵا ئەبەنە لای پۆسیدۆن و لە ئەنجامدا ئاندرۆمەد لە بەردەمی ئەژدیهایەکدا

بە ڕەوەزێکەوە ئەبەستنەوە، پرسیۆس ڕزگاری ئەکا و ئەیخوازێ و ئەبن بە خاوەنی حەوت کوڕ و کچێک.

**ئاواز:** دەنگ، ئاوا.

**ئاوبارە:** پردی ئاو گواستنەوە.

**ئاوڕدانەوە:** لاکردنەوە، بۆ دواوە ڕوانین.

**ئاوەندیار:** بەریوان، هۆی سازدانی نێوان دوو لایەن [ف] دلال، واسطە [ع] وسیط.

**ئاوەزمەند:** ژیر، تێگەیشتوو، فرەزان، خاوەن فەرهەنگ، کەردەی [ف] فرهیختە.

**ئاوێزە:** چلچرا [ع] ثریا.

**ئاویەر:** ئاودەر، ئاوبارە.

**ئاهۆ:** پەتا، درم، نەخۆشی گیرۆ، ئازار، شێتی، لێویی، کەمایەسی، فێ، تاعوون :: ئاهۆیەکی زۆر ئەستەمە.

**ئاهەنگ:** بەرنامە، ڕێوڕەسم [ع] [ف] مراسم.

**ئایش:** خێرتە، ئەو زەویەی لە کاتی خۆیدا ئەکێلرابێ، زەوی نۆرە.

**ئاین:** مسۆگەر، یقین:: لێت ئاین ئەبێ: لات مسۆگەر ئەبێ.

**ئایەخ:** ناگرنگ، هیچ [E] insignificant.

**ئایەن:** مسۆگەر، دڵنیا :: لێم ئایەن بوو: لام مسۆگەر بوو.

**ئۆبۆسوون:** Aubusson ناوی کارگەیەکی پاشایەتی پەردەچنینە لە سەدەی پانزە تا هەژدە.

**ئۆبێرت ڕۆبێر:** Hubert Robert [E] (١٧٣٣-١٨٠٨) لە پێشڕەوانی ڕۆمانتیسیزمی فەڕانسە، وێنەگەری شوێنی کەونارا و لاواری کەلاوەکان.

**ئۆگر:** خووپێگرتوو.

**ئۆگرەت:** خوو، خدە.

**ئۆلیڤیە مێترا:** Olivier Métra (١٨٣٠-١٨٨٩) مایسترۆ و ئاوازدانەری فەڕانسەیی.

**ئوردیبەهەشت:** یان ئەرتەوهێشت، مانگی گوڵان، ناوی مانگی دووەمە لە مانگە دزراوەکانی کوردی، کە میرزا سادقی دینەوەری لە سەدەی سیانزە بە جوانی پەلکەزێڕینە هۆنیویەتەوە:

وەرینـــان واتـــەن ســـاڵ دوانـــزە مانگەن
هـــەر مانگـــێ وێنەی ملک شـــش دانگەن
هـــەر مانگـــێ پەریـــێ بەنـــەن وە باڵاش
هەر پەریێ ســـەد ڕەنـــگ مەنمانۆ کالاش
مانـــگ یەکەمـــش مـــای « فەڕوەدانەن»
گـــوڵ و وەنەوشـــە پـــەر نـــە هەردانەن
مانـــگ دووهەمـــش «ئەرتەو هێشـــتەن»
ئای ئای کوردســـتان وێنەی بەهەشـــتەن
مانگ سێومشـــەن مانـــگ «هەروەتاتەن»
مانـــگ هەڵاڵـــە و گەزیـــزە واتـــەن
مانـــگ چوارەمـــش مانگ «تێشـــتەرەن»
کەژ و کۆ و دەشـــت نەی دەم وەشتەرەن
مانـــگ پەنجەمـــش مانـــگ «ئەمرتاتەن»

مانــگ بــێ مەرگــی و کام و هاواتــەن
مانــگ شەشــەمش مانگ «شــترووەرەن»
مانــگ هەســارە و ئافتــاو و وەرەن
مانگ هەفتەمــش هەر مانــگ «میترەن»
مانگ شــایی و وەشــی و بەراتی مێهرەن
مانــگ هەشــتەمش مانــگ « ئاوانــەن»
مانــگ ئاویــاری دەشــت و کاوانــەن
مانــگ نۆهەمــش مانــگ «ئاهــرەن»
زێــڵ جــە پــەژارە یەکســەر باهــرەن
مانــگ دەهەمــش مانــگ «دەتۆشــەن»
هەر کەســێ پاک بۆ ئەو خاوەن هۆشــەن
مانــگ، یانزەهەمش مانــگ «وەهمەنەن»
مانــگ پــاکان و مێــردان وەنــەن
مانــگ دوانزەهەمش «ســپەندار مەزەن»
مانــگ ژنــان و دویەتــان گــەزەن
ســادق، گوفتــارت خەیلــێ شــیرینەن
بێگۆمــان ئانــە واتــەی دێرینــەن

**ئورکید:** گوڵی گیاسالمە E orchid.

**ئوستادی ئاسنگەر:** Le Maître de forges رۆمانی ژۆرژ ئۆنە، ١٨٨٢.

**ئوریدیس:** Eurydice لە میسۆلۆژی یۆنانی کچی ئاپۆلۆ خودای رووناکییە، هاوسەری ئۆریفۆس بوو کە هەوڵی دا بە مووزیکی بەسۆزی خۆی لە مەرگ بیگەڕێنێتەوە.

**ئەبداڵ:** ☜ عەبداڵ.

**ئەبولفەزل:** عەباسی کوڕی عەلی کوڕی ئەبی تالیب، ناسراو بە ئەبولفەزل و لەبەر ئەوەی گەنجێکی قۆز و بوێر بووە لە لای شێعە بە قەمەری بەنی هاشم ناودێرکراوە، لە شەڕی کەربەلا لەگەڵ ئیمام حسێنی برای کوژراوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە سەقا بووە و ئاوی داوە بە هێزەکەی خۆیان پێش ئەوەی بیکوژن، دەستیان بڕیوە.

**ئەبڵەق بوون:** مۆڵەق بوونی چاو.

**ئەبیێ:** ئەبیسێ.

**ئەتاڤیزم:** atavism میراتی خوێنی، شێوە و خوو و ئەدگاری میراتی دا و باپیران.

**ئەخێورایەوە:** لە خێورانەوە واتە دڵی خەریک بوو سۆی ئەبوویەوە، دڵی خەریک بوو ئەتوایەوە، ئەم دارەتە پەیوەندی بە باری دەروونی مرۆڤەوە هەیە، نەک ئازاری جەستەیی.

**ئەددی:** زۆر وایە؟

**ئەدگار:** تایبەتمەندی. فرۆزە ف صفت، خاصیت.

**ئەرباب:** خان، خاوەن، زەویدار.

**ئەرتابان:** ئەرتابان Artaban ژنراڵێکی ئەرمەنی نەژادی سپای ڕۆمای ڕۆژهەڵات یان ئەمپراتۆری بیزەنتی لە سەدەی شەشەم لە سەردەمی جاستینیەن.

**ئەرخایەن:** دڵنیا.

**ئەرخووت:** لۆلەپەی مەشکە، دوو داری گرۆڤەری خەڕاتیکراوی لە دۆژەنگ خراو.

**ئەردەکان:** ناوی شارێکە لە پارێزگای فارس، شارێکیش بە هەمان ناو لە پارێزگای یەزد هەیە.

**ئەرژەنگ:** دارێکی سەختە کەمانی لێ دروست ئەکەن.

**ئەراِبە:** عەرەبانە، کە هەم گارییە بووە و هەم جۆرێکی قورس و قۆڵی لە جەنگدا بەکار هێنراوە.

**ئەزمان گا:** زمانەگا، گیایەکە گەڵاکەی لە زمانی گا ئەچێ، بۆ واتای «گاوزبان»، لە فەرهەنگی فارسی دێهخودا نووسراوە بە کوردی پێی ئەوترێ (ازمان غا) کە هەمان «زمانەگا» یە.

**ئەسپادەم:** یان سێنتۆر Centaur گیانەوەرێکی ئەفسانەیی نیوە مرۆڤ نیوە ئەسپە.

**ئەسپۆن:** سپۆن، گیایەکە گوڵی تۆپ و گەڵای دڕکاوی و ریشەی ئەستووری هەیە. ریشەکەی وشک ئەکرێ و ئەکوترێ, ورد ئەکرێ و وەکوو سابوون بۆ جلشۆردن بەکار ئەهێنرێ.

**ئەسپەندەر:** دەنکی گیایەکە خڕ بە قەد نۆکێک ئەبێ بەڵام ناوەکەی بۆشە و تەنها چەند دانە تۆوی وردی تێدایە، بۆ چاوەزا ئەیکەنە ناو ئاگر و زیاتر ئاگری پۆلوو، کاتی سووتان قرچەی لێوەدێ و بۆنێکی خۆش بڵاو ئەکاتەوە :: وەک ئەسپەندەرێک بەسەر ئاگرەوە، مایەوە: هەر دەم بۆی هەبوو بتەقێتەوە، خۆی پێ رانەگیرێ و دەرپەڕێتە دەرەوە، چونکە ئەسپەندەری سەر ئاگر لەپڕ ئەتەقێتەوە.

**ئەستوندەک:** کۆترە، کاریتە، داری راگرتنی خێوەت.

**ئەستێرک:** حەوز، کەمە ئاو کە بەری بگیرێ بۆ ئاوداشتن.

**ئەسمەرپێچ:** رەشماڵ، کۆن، رەشماڵی جاف.

**ئەشکۆڵ:** شەوژەن، داری پشت دەرگا بۆ داخستن.

**ئەشکەبووس:** جەنگاوەرێکی کەشانی بوو، لە شەڕی ئێران و تووران یارمەتی ئەفراسیاوی تووارنی کرد و لە شەڕی کامووس، ئەفراسیاو ئەوی نارد بۆ یارمەتی پیرانی ویسە. رۆستەم بە پیادە شەڕی لەگەڵ کرد و بە تیرێک کوشتی.

**ئەشکەڵە:** مەنگەنەی ئاسنگەر، ئامرازێکی جەزرەبەدان قامکی تاوانبارکراویان لەناو دەنا و بە پەت جەڕەبەبایان دەدا.

**ئەفەرۆز:** رووشکاو، دەرکراو، تەرەکراو ع مرفوض.

**ئەڤان:** ئیرادە، بڕیار.

**ئەقرساند:** ئەخەملاند :: لە قرساندن.

**ئەڵقەرێز:** زنجیرۆکەی دەرگا داخستن.

**ئەمارە:** هێما، ئیشارە.

**ئەنداند:** andante بەشی خاو یان ئارامی

سۆنات.

**ئەنگێزە:** ئەنگێز، دنەدەر، هۆ :: ژ رەعنا نێرگزێن تەی مەست و خونریز-زەمان بۆ عەهدی جەنگ ئەنگێزی چەنگیز «مەلای جزیری»

**ئەنووشە:** ناوی خوسرەوی نەوشیروان کوڕی قوبادی یەکەمی ساسانی، بە عەرەبی کسری، کە لە ماهەکدا ئەنووشەڕەوان یان نووشینڕەوان بووە، لە پادشایانی بە دەسەلاتی ساسانی لە سەدەی شەشەمی زاینی کە سەردمی پادشایی ئەو شکۆدارترین قۆناخی دەسەلاتداریتی ساسانیەکانە، ساڵی ٥٦١ز لە پاش شکانی حکوومەتی بیزانس، پەیماننامەی ٥٠ ساڵەی کۆتایی جەنگ لە نێوان دوو دەسەلاتی گەورەی ئەو سەردەمەدا واژۆ ئەکرێ و، ئیمپراتۆری رۆم ناچار ئەبێ بۆ ماوەی ٥٠ ساڵان بێ بە باجگوزاری نەوشیروانی ساسانی و ساڵانە باجی بداتێ.

**ئێدن:** دیسان، دیسانەوە، ئیتر.

**ئیمپراتۆری گوڵ:** The Empire of Flora، بەرهەمی نیکۆلای پووسین Nicolas Poussin (١٥٩٤-١٦٦٥). ماخوای «گوڵ» لە باخێکدا لە نێوان کۆمەڵێک پەری و پاڵەواندا ئەبینرێ و عەرەبانەی خوداوەندی خۆر لە ئاسمان بە سەر هەورەوە داژوێ.

**ئەوک:** گەردن، گەروو، قوڕوو.

**ئێرەیی:** بەخێلی.

**ئێزنگ:** هێزم.

**ئینیید:** Aeneid داستانێکی شیعری لاتینی نووسینی **ڤێرژیل** Virgil لە ٢٩ پ.ز. بەسەرهاتی **ئەینیاسی** Aeneas خەڵکی ترۆی Troy، ئەچێ بۆ ئیتالیا و ئەبێ بە دامەزرێنەر و باپیرەی رۆمانەکان. ئەم دەقە لە ٩٨٩٦ دێڕ شیعری شەش برگەیی لە سەر کێشی پەنجەیی پێکهاتووە.

**ئیلووژن:** هەڵوەسە، تراوکە، خەیاڵ.

b




**بابڕ:** پەنا با، شوێنێکە با نەیگرێتەوە.

**بابی:** دەهری، بەهایی. لە ئاخافتنی رۆژانەدا ئەم وشانە کەم تا زۆر هاوسەنگ و بەیەک واتا بەکار ئەبرێن :: دەهریت کردم :: کابرایەکی بابیە. بەڵام هەرکام لەمانە ئەگەڕێنەوە بۆ فەلسەفە و بنەمایەکی تایبەت. **دەهری** واتە ئاتەئیست و بڕوابوون بە سروشت و کۆنینە بونی دنیا، بابی و بەهایی بەڵام دینن؛ **باب**، واتە میرزا سەید عەلی محەمەدی شیرازی لە ساڵی ١٢٣٥ی کۆچی مانگی، سەدەی نۆزدەی زاینی لە شیراز لە دایک بوو،

هەرچەند خۆی بە زۆر شت داناوە، بەڵام بە دانەری دینی بابی ئەژمێردرێ. ئەو خۆی بە مژدەدەری ئاینێک ئەزانی کە لە پاش خۆی لەلایەن «من‌یظهرالله»وە ئەنێردرێ. لە دوای **باب** زۆرکەس خۆیان بە «من‌یظهرالله» زانیوە. بەهاییەکان پێیان وایە «من‌یظهرالله» هەمان میرزا حسەینعەلی نوورییە کە ئەوان بە «بهاءالله»ی ناوئەبەن. زۆربەی بابیەکان «بهاءالله»یان بە «من‌یظهرالله» قبووڵ کرد و بوون بە بەهایی. ژمارەیەکی کەمیان «سوبحی ئەزەل» برای بابیان بە جێگری باب دانا. باب شەش ساڵ پاش ئەوەی داوای پێغەمبەرێتی کرد بە فەرمانی **ئەمیر کەبیر** لە تەورێز تیرەباران کرا، تەرمەکەی خرایە بەر سەگ، بەڵام بەهاییەکان شاردیانەوە و لە پاش شەست ساڵ شاردنەوە، گەیاندیانە ئیسراییل و لە کێوی **کارمەل** لە **مەقامی ئەعلا** لە شاری حەیفا ناشتیان. مەقامی ئەعلا شوێنی پیرۆزی دووەمە لای بەهاییەکان. رووگەی یەکەمی بەهاییەکان گۆڕی بەهاءالله یان **رەوزەی موبارەکە**یە لە شاری عەکا، کە کاتی نوێژکردن روو لەوێ ئەکەن.

**باج:** وێر، خاوە،ماڵیات.

**باخی ئەتابەک:** باخ و سەرایەکە لە تەورێز، ستار خانی سەرۆکی مەشرووتە خوازانی تەورێز کردی بە بنکەی خۆی و پاشتر رووسەکان کردیان بە باڵوێزخانەی خۆیان.

**باخی دڵگوشا:** یەکێکە لە باخە بە ناوبانگەکانی شیراز، کە خزنی سەعدی ئەکەوێتە لایەوە. هەندێک ئەڵێن کەریمخانی زەند دروستی کردووە و هەندێک ئەڵێن لەوەش کۆنترە و هی سەردەمی ساسانیەکانە.

**بادامی:** چاو بادامی: ئەوانەی چاویان وەکوو ئەو مەنگول و تەتارانەیە کە نموونەیان لە ناوچەکە ماوەتەوە؛ خوار، لار.

**بادرز:** درزەبا، دەروویەکی بچکۆلەیە بۆ هاتوچۆی هەوا.

**بادیهەوا:** خۆڕایی، فیز، بەدەعیە و لەخۆ دەچوو.

**باربوو:** یارمەتیدانی هەژار و پەککەوتە بە پارە و ماڵ.

**بارگاوی:** پڕ، تەژی، دارماڵ.

**بارمتە:** گرێو، بە ئەمانەت دانراو.

**بارێزە:** گیایەکە لە کەرەوز ئەکات.

**بارێزە:** تۆفی باران و هەور تریشقە.

**بازگەی زیندانی:** prisoner's base یارییەکە دوو دەستەی نۆ دە کەسی لە گۆڕەپانێکی مەزندا هەرکام پەڕۆیەک هەڵئەواسی بە بەر پشتێنەیدا و هەر کەس هەوڵئەدا

پەڕۆکە لەویتر بکاتەوە و زیندانی بکا.

**باسریشک:** ڕێژنە، ڕەهێڵە، بەفر و باران و با پێکەوە.

**باسیل:** bacillus باکتریای نەخۆشینی cholera یان چاوەقووڵکە.

**باشتین:** گوندێکە لای سەبزەوار.

**باکەف:** خشتی نیوە سوورەوەکراو.

**بالۆرە:** جۆرێک لە سروود و پیاهەڵگوتن و لاواندنەوە :: بەیت و بالۆرە.

**باڵ:** قۆڵ :: باڵی لەچک: لۆی لەچک، لفکەی لەچک :: باڵی سەڵتە: شاقەلی کەواسەڵتە، ئاتەک.

**باڵانی:** هێسری باوک ئەسپ و دایک کەر.

**باڵشمە:** چوارچێوەی دەگا و پەنجەرە.

**باڵماسکە:** bal masque فەرانسی، لە دوو وشەی باڵ و ماسکە بە واتای کۆڕی سەما بە ماسکەوە، هەموو جۆرە دەمامکێک بۆی هەیە.

**باڵنج:** سەرین، بالیف.

**بانوو:** بان، بۆرگە، پلاتۆ :: بانووی ئێران ☜ فلات.

**بانیجە:** بانی بچووک، بەرهەیوانی سەرئاوەڵەی خانوو، باڵکۆن، تەراس.

**باوانی:** جیازیی بووک لە ماڵی باوانیەوە.

**باوڵ:** یەخدان، سندووقی گەورەی تەنەکە بۆ جلوبەرگ یان کەلوپەل.

**باویلکە:** پەپوولەپایزە، شەلەمینکەرە.

**باهۆ:** باسک :: شان و باهۆ.

**باهۆز:** گەردەلوول، گژەبا.

**بایرۆت:** Bayreuth، لە ئاڵمان، ناسراو بە شاری ڕیچارد ڤاگنر، لە کۆتایی سەدەی نۆزدە ببوو بە ڕووگەی لایەنگرانی مووزیک و ڤاگنر. ڤستیڤاڵی بایرۆت تا ئێستاش هەیە.

**بتون:** ڕێکوپێک، لەبار، خەملێو.

**برایمی ئەدهەم:** ساڵی سەدی کۆچی، سەدەی حەوتی زایینی لە دایک بووە، لە سۆفیانی بە ناوبانگە. برایمی ئەدهەم پادشای بەڵخ بووە، ڕۆژێک چاوی بە کابرایەک ئەکەوێ لە سێبەری دارێکا دانیشتووە، پارچەیەک نانی ڕەق لە توربێنەکەی دەر ئەهێنێ، ئەیخوات و قومێک ئاو ئەکا بەسەری دا و هەر لەوێ لێی ڕائەکشێ. برایم بە بینینی ئەو دیمەنە لە خەوی سەوخان و نەزانی دائەچڵەکێ و دێتەوە بەخۆیدا، دەست لە پادشایی هەڵئەگرێ و گوایە نۆ ساڵان لە ئەشکەوتی هەوت کوول نزیکی نەیشاپوور خەڵوە ئەکێشێ و وەک غەوارە ئەژی، کە ئەناسرێتەوە لەوێ ئەڕوا و ئەچێ بۆ مەکە و مەدینە و لە مەکە کۆچی دوایی ئەکا.

**برج:** کۆنگرەی قوتی قەڵا.

**برنج:** کانزایەکی تێکەڵەی مس و فافۆن.

ئالیاژی لە سەدا ٦٠ی مس و لەسەدا ٤٠ی فافۆن.

**برووو:** church of Brou کلیسای گووتیکی بروو لە ناوچەی Ain لە ڕۆژهەلاتی فەڕانسە، کە مارگریت دیترش بە یادی مێردەکەی فلیبێر دووکی ساڤۆی دروستی کرد کە سێ ساڵ پاش زەماوەندەکەیان مرد.

**برێسانت:** Jean Baptiste Prosper Bressant (١٨١٥–١٨٨٦)، ئەکتەری کۆمێدی فەڕانسە، جۆرێک قژی لە پێشەوە کورت و لە پشتەوە درێژی کرد بە باو.

**بڕشت:** هێزی بڕین، بڕس، پیت، کووز، قاش :: بەبڕشت.

**برنۆتی:** سعووتی، تۆزێکی پژمەهێنەرە بە لووت ئەکێشرێ بۆ سەرخۆشبوون ف ع انفیه.

**بەرس:** ئەو چێوەی لە لووتی وشتری ئەکەن.

**بریسکانەوە:** درەوشانەوە، بریقەدانەوە.

**بز:** کراوە، داچەقاو :: چاوبز.

**بزگوڕ:** کوتەپەڕۆ. تیکە، تکە.

**بزنمژە:** گیانەوەرێکە لە نێوان مارمێلک و سووسەمار. بە زمان هاویشتن نێچیری خۆی راو ئەکا.

**بزەباقە:** دانکە، بزن مەرگی.

**بلانش دو کاستی:** Blanche of Castile (١١٨٨–١٢٥٢) ژنی لویی هەشتەم و دایکی لویی نۆهەم بوو. لە خولی سەرپەرشتی دەسەلاّت توندوتیژی و زەبروزەنگی زۆردارانەی نواند کە لە مێژوو و وێژەی فەڕانسەدا بەناوبانگە

**بلاوێن:** سازگار، فێنک کەرەوە، ئارامبەخش ف گوارا.

**بلێز:** بلێسە.

**بلووری:** مۆری، خامی سپی سادە.

**بلێسە:** گڕ ف الو، شعلە.

**بنبەست:** داخراو، کۆلاّنی داخراو.

**بنکۆڵ:** دوامناڵ ع آخر العنقود.

**بنکۆڵکردن:** ڕەهۆڵ لێدان.

**بنۆتزۆ گۆتزۆلی:** Benozzo Gozzoli (١٤٢١–١٤٩٧) وێنەگەری فلۆرانسی سەردەمی ڕێنسانس. بۆ وەردەکاری لە بەرهەمەکانیدا و وەکوو ئوستادێکی جیهانی گۆتیک ناسراوە.

**بۆتکە:** کیوسک، خانووی لە دار و تەنەکە، دووکانی تەختە.

**بوخارا:** پێنجەمین شاری گەورەی کۆماری ئوزبەکستانە. دانیشتوانی بوخارا تاجیکن و بە فارسی تاجیکی قسە ئەکەن، هەڵووژەی زۆرە و ئاڵوو بوخارای بەناوبانگە.

**بوخچە:** جاجم یان مەوج یان پارچە قوماشێکی گەورە بۆ کەلوپەل تێنان.

**بودلێر:** Charles Baudelaire (١٨٢١–

١٨٦٧) هۆنەر و ڕەخنەگری فەڕانسەیی.

**بوزخور:** ڕێ تێچوو ع ف محتمل.

**بوودڕ:** درز، قەڵەش ف شیار.

**بۆرەکە:** بۆرەپیاو، مرۆی بەرەڵڵا.

**بۆزەن:** زۆر بۆنکەر، ئەو کەسەی توانای بۆنکردنی بەهێزە.

**بۆژوو:** گیای بۆنگرتوو کە ئاژەڵ نایخوات.

**بۆسۆ:** پارچە پەڕۆی سووتاو کە ئەخرێتە سەر برین.

**بۆسوی:** Jacques Bossuet (١٦٢٧–١٧٠٤) مەتران و ئاییناسی توندڕەو.

**بۆشناخ:** بەخۆی بەهێز؛ کۆک و پۆشتە، بەدەماخ.

**بۆهیمی:** Bohemian بۆهیمیایی، هونەرمەندی بەرەڵڵا، قەرەچی، کۆچەر.

**بوور:** نەکێڵراو، بەیار.

**بوورین:** پسوولەی لێبوردن لە لایەن میرییەوە، بەڵگەنامەی بەخشران لەلایەن حکوومەتەوە.

**بووزوو:** شاڵی ڕانک و چۆخە لە خوری و مەرەزە.

**بووم:** زەوی :: بوومەلەرزە: هەژانی زەوی.

**بەختە:** مەڕ و بزنی دوو ساڵان.

**بەرایی:** بەراهی، ڕەوادیتن :: دڵم بەرایی نادا ئازاری بدەن؛ ئوقرە :: دڵم بەرایی نایە.

**بەپیز:** بەبار.

**بەتین:** بەگوڕ، پڕشۆر، بەهەست.

**بەختەمام:** مرۆی ڕاست و قسە پتەو.

**بەختەوار:** بەویژدان و ڕاستگۆ، پاکیزە.

**بەدەمار:** بەفیز، بەدەعیە، لەخۆبایی، مێرخاس، بەغیرەت.

**بەدەو:** جوان، شیک، خوشیک، لاوچاک.

**بەردەبیرۆ:** بەردێکە بۆ ڕەقی و سەختی نموونەیە :: وەک بەردە بیرۆی لێهاتووە: خاراوە؛ مامەخەمە. ف سنگ صبور. ع صخرة صماء.

**بەرزا:** منداڵی یەکەم، کەسی یەکەم، سەرتۆپ.

**بەرازە:** لێوی سەرەوەی وشتر یان پاتاڵ بەرازەیە، لێوی خوارەوە شیرەیە :: شیرە و بەرازە: لێوی سەروو و خواروو.

**بەراوەژوو:** هەڵاوەگێڕ.

**بەرچەوەن:** دیمەن، چاوگە، تەماشاگە.

**بەرچاوگە:** دوو پارچە چەرم کە ئەدری لە سەرکەللەی یەکسم لە ئاستی چاویدا بۆ ئەوەی ئەملا و ئەولا نەبینێ و سەرنجێ چەق ببەستێتە بەردەمی.

**بەرخۆ:** وریا و ئاگادار.

**بەرزکردنەوە:** هەڵگرتنی ژن بەفێڵ، هەڵگرتن، ڕەدووخستن یان /کەوتن.

**بەرزە:** قوتکە :: لێم بووە بە بەرزەکی بانان؛ قیتایی لەناو تەختاییدا.

**بەرزەبایی:** لووتبەرزی، بەرزەفڕی، بەرزەخوازی.

**بەرزەخوازی:** بەرزەفڕی ف جاهطلبی.

**بەرزەبڵێس:** چەورە، مشەخۆر، خۆ تێهەڵقورتێنەر.

**بەرژەنگ:** لۆگۆ، نیشانە، ئارم.

**بەرگ رەش:** ئەمازەیە بە یارانی بزووتنەوەی بەهزادانی کوڕی وەنداهورموز ناسراو بە ئەبوومسلیمی خوراسانی کە بەرگی رەشیان لەبەر ئەکرد، ئەبوومسلیم لە کوردەکانی راوەندی خوار شەمزینانە لە سەدەی هەشتی زاینی، توانی نەک هەر خوراسان بەڵکوو نیشتمانی کوردان، زاگرۆس و ئاناتۆلی و میسۆپۆتامی لە هێزەکانی ئەمەوی پاک بکاتەوە.

**بەرگە:** هێز، وزە، توانا :: بەرگەی نەگرت: هێزی پێ نەشکا، لەبەری بەزی:: بەرگەی دڵ: قوەتی دڵ، وزەی دڵ.

**بەرماڵبەکۆڵ:** جانمازآبکش E prudery.

**بەرەدان:** بەرەپێدان؛ گەورەکردنەوە لە ئاستی پانی، پان کردنەوە :: بەرەی بدە: پانی بکەرەوە، بەڵام درێژییەکەی وەک خۆی بێ.

**بەرەک:** چۆخەی درێژ لە شاڵی بووزووی خوری و تووکی وشتر؛ جبەی خوری؛ دەلمە

**بەرهەدا:** ڕووبەڕوو، ڕواوڕوو ف ع حضوری.

**بەرهەڤ:** تەیار، ئامادە.

**بەرهەڵدا:** ئازاد، بەرەڵڵا، بەرئاواڵە.

**بەرهەنگ:** نەخۆشی هەناسە سواربوون، تەنەگە نەفەسی.

**بەریوان:** ئاوەندیار، هۆی سازدانی نێوان دوو لایەن ف دلال ع وسیط.

**بەڕا:** زانا، دەمڕاست.

**بەڕەزا:** گیایەکی جوانە بە کاوانەوە ئەڕوێ.

**بەڕینگاڵ:** پەزی تیسک درێژ.

**بەزا:** خوشڕەو، خۆشبەز.

**بەزاخ:** دەغەڵ، فێڵەباز، دووڕوو.

**بەزیبک:** بەبڕشت، بوێر و بەوەج.

**بەژماڵە:** ڕەبەن، بێتاوان، گوناح، تایەن، هەژار.

**بەست:** بەستی تریاک: بە ئەندازەی نۆکێک تریاک کە لەسەر حوقەی وافوور دائەنرێت.

**بەستن:** گرێدان، شەتەکدان، بەندکردن، سەهۆڵکردن، مەیین.

**بەستراو:** زاوای ئەچێتە پەردە و گانی پێناکرێ.

**بەستێن:** دەروو، زیخەڵانی کەنار چەم، تەخت، بەستێنی چەم؛ فرێزەر، یەخەچاڵ.

**بەشکۆ:** کومپانیای بازرگانی هاوبەش ::

بەشکۆی بازرگانی: کومپانیا یان شەریکەی بازرگانی.

**بەفەر:** بەباش :: بەفەرِ زانین: بەباش زانین.

**بەلاوە:** سەرەتا، یەکەم.

**بەن:** هەودای لە خوری و موو، دەزوو.

**بەندە و کوێخا:** هەژار و دارا، پلەبیەن و پاتریسیەن، بۆرەپیاو و ئاغە.

**بەور:** لە سەدەی هەژدە و نۆزدە بە شاگرد عەرەبانەچی ئەوترا کە لە پشت فایتوونەکەدا بوو و ئەوەندەی فایتوون ئەوەستا، خۆی هەڵئەدایە خوارەوە و دەرگای بۆ سەرنشینەکە ئەکردەوە.

**بەوزەرە:** ناشیرین، دزێو.

**بەوست:** بە ئەنقەست، ئاگاهانە، بەئاگا، بە زانین، بەعەمد.

**بەهاربەند:** شوێنێکی پەرژینکراو بەهاران و هاوینان ئەسپ و پاتاڵی تیا رائەگرن، گەوڕی سەر ئاوەڵە.

**بەیار:** زەوی نەکێڵراو، بوورە.

**بەیبوون:** گوڵە زووفا، گوڵی داودی E .chrysanthemums

**بێ تەشە:** بێ ئارام، بێ ئوقرە ف بیتاب.

**بێر:** شوێنی کۆبوونەوەی مەڕ و ماڵات.

**بێرنیس:** Berenice شازادەی جوولەکەی کەسایەتی تراژێدی ڕاسین، کە تیتۆس بردی بۆ ڕۆما، بەڵام لە ترسی ئەوەی خەڵکی پێیان خۆش نەبێ ئیمپراتۆر ژنێکی بێگانە بخوازێ، مارەی نەکرد.

**بێری:** مەڕدۆش، ئەو کیژانەی ئەچن بۆ بێر بۆ مەڕدۆشین.

**بێریڤان:** بێری.

**بێسە:** مەرایی، زمانلووسی :: بیسەیی کردن: ماستاوکردن.

**بێگاری:** سەربازی.

**بێلوار:** Belloir، ناوی کومپانیایەکی گەورە بوو کە کورسی و تەپڵەکی ئەدا بە کرێ.

**بێلایی:** بەرهەیوان.

**بێڵەکان:** پیشکان.

**بێن:** بەرامە.

**بێنڤێنوتو چێلینی:** Benvenuto Cellini (١٥٠٠ـ١٥٧١) زێڕینگەر، پەیکەرتاش، هێڵکار، سەرباز و مووزیکزانی ئیتالیایی و هەروەها نووسەری ئوتۆبیۆگرافییەکی زۆر بە ناوبانگە.

**بێواز:** سست و داهێزراو، وزە لێ براو.

**بیرازکردن:** دەمەزەرد کردنەوەی داس و مەڵەغان بە یارمەتی کوورەی ئاسنگەر و کوتانەوە.

**بیرجەند:** ئەم شارە ناوەندی خوراسانی باشوورە. شێعە و سونی تێکەڵن، مافوورە و هەورێشم و زەعفەرانی بیرجەند بە ناوبانگە.

**بیستۆک:** گووشی تەلەفوون.



**پاپۆکە:** پەپکە بەستن، ئاڵقەپێکان، ئاخلە.

**پاتاو:** کاڵە.

**پاتەختی:** شەوگەڕی پاش پەردە، بەیانی پاش شەوی پەردە، ڕۆژی پاش زەماوەن.

**پاچرا:** وار یان خاوەی خاوەن قومارخانە.

**پادەری:** پلیکانەی ناودەرگای پاس.

**پاراڤان:** تەیمان 🄴 paravento écran.

**پاراو:** نەخت و پوخت، تێراو، شەق و تورت و لەگەشە.

**پارچ:** تۆنگە، سوراحی.

**پارسا:** بەدین، لەخواترس، خۆپارێز، تەرکەدنیا.

**پاساو:** داوای لێبوردن بە بادانەوە و مەرایی کردن.

**پاسفەند:** ڕزیو، گەندەڵ، پواو.

**پاسیاو:** پێ ڕەش، بەدفەرجام.

**پاشکۆش:** پاشکۆی کراسی بووک 🄴 bridal train ::بەرکۆش و پاشکۆش.

**پاشنووس:** دەرکەنار 🄴 postscript.

**پاشوەن:** عەگاڵ، چۆکبەندی وشتر.

**پاشەرۆک:** پاشارۆ، بەرماوە، میوە یان شتی بەجێماو.

**پاکار:** خزمەتکار، کارێکاری شاکرد، بەردەست.

**پاکڵە:** پایە :: پاکڵەی پرد کە لەناو ئاوەکە لە قووڵایی‌دا چەقێنراوە، خۆی لەبەر تەوژمی ئاوەکە ڕائەگرێ قورسایی پردەکە لە سەریەتی.

**پاڵانی:** کەری بچووک کە بۆ باربردن بشێ.

**پاڵە** دروێنەوان، کرێکاری درەوکردن.

**پانزەی ڕێبەندان:** ☜ دکتور.

**پاوان:** قۆرخ، مێرگ و باخ و کەوشەنی تایبەتی کەسێک نەتوانێ سەربەخۆ بچێ تێی :: لە باخچەی ساوای پاوانی سینە-پەنجەم سەرگەرمی لیمۆ گووشینە «هەژار».

**پاوانخواز:** قۆرخکار، پاوانکار، کەسێکە کاڵایەک ئەشارێتەوە بۆ گران بوون 🄵 محتکر.

**پاوانکردن:** قۆرخکردن.

**پرزە:** وزە و توانا، هەناسە، هەناسەدان، ئەمان :: پرزەی لێ‌بریوم.

**پرووسک:** مۆغەرەی پشت.

**پرکێشی:** سووربوون و پێداگرتن لەسەر مەبەست، وێران، لەخو ڕابینین :: پرکێشیم نەکرد: بەخۆمدا نەپەرما، لە خۆم ڕانەبینی.

**پرۆتۆزوا:** protozoa، گیانەوەری یەک شانەیی.

**پریماڤێرا:** Primavera واته **بەهار**، تابلۆی بەرهەمی بووتیچیلی.

**پرینس دوگاڵ:** Charles de Galles نازناوی فەڕانسەیی شازادە ئیدواردی کوڕە گەورەی شاژن ڤیکتۆریایە (١٨٤١-١٩١٠). لە ١٩٠١ تا ١٩١٠ شای ئینگلیس بوو و بەشداریکردنی لە کۆڕەکانی فابۆڕ سەن ژێرمەن، گرووپە شاپەرستەکانی ئەم کۆڕانەی کردبوو بە خاوەنی پرستیژ و کێشەرێکی مێژوویی ڕاستەقینە.

**پزوو:** دەرەلنگ یان ناوقەدی دەرپێ کە کەژی تێئەکەن.

**پشتێر:** گەوڕ، ستەپڵ.

**پشک:** بەش، بەخت؛ تیر و پشک ف ع قرعة.

**پشیلەشۆر:** لستنەوەی بنی قاپ بەو جۆرەی پشیلە بە زمان ئەیلێسێتەوە.

**پلانتە:** Francis Planté (١٨٣٩-١٩٣٤) پیانۆژەنی زۆر بە توانای فەڕانسەیی.

**پنچک:** دەوەن.

**پنگر:** پەرەنگ، پۆلوو، سکڵ، پن، پۆل.

**پۆ:** تێوەدانی تەون، هەواڵی ڕایەڵ :: تان و پۆ.

**پۆپ:** پلەی یەکەم لە کلیسای کاسۆلیک :: پۆپ، کاردیناڵ، مەتران، قەشە.

**پۆپەشمینە:** چنراوێکی پەشمینی ناسک و گرانباییە.

**پۆتەن:** Pierre Potain (١٨٢٥-١٩٠١) زانای نەشتەرگەری دڵ و خاوەنی چەندین پەرتووک دەربارەی دڵ و سی، ئەندامی ئاکادێمی زانستی فەڕانسە.

**پۆرگ:** پێستی مردووی قەتماخە بەستوو.

**پۆز:** لووت، دەم و لووتی ئاژەڵ؛ دفره.

**پۆل:** دەستە :: پۆل و کەرت و لق.

**پۆلۆنزی:** polonaise فەڕانسەیی وشەی Polish، سەمایەکی ژێدەر پۆلۆنی.

**پواو:** پووک، پووکاو.

**پومرانیا:** Pomerania بە واتای **وشکی ناو ئاو** ناوچەیەکی مێژووییە لە باشووری زەریای باڵتیک، دابەش بووە لە نێوان ئاڵمان و پۆلەندا.

**پووش:** سەبەتەی حەسیر خورما یان شمەکی تێئەکرێ :: پووشی خورما.

**پووڵەکە:** ئۆیبە، بریقە، تەنەکەی ناسکی خڕی بریقەداری ورد ئەدرێ لە لەچک و سەرپۆش.

**پەترۆکە:** قەتماغە.

**پەتک:** قەلادەی ملی سەگ، قەڵەنگ.

**پەتەری:** پەتیارە.

**پەچە:** شوێنی سەرگیراوی حەشاردانی مەڕ و ماڵات.

**پەراگەندە:** پەرش‌وبڵاو، ئاژەڵی لە مێگەل دوورکەوتوو.

**پەرداختکردن:** ساف و لووس کردن.

**پەردوو:** پەردە، ژووری بووک و زاوا لە شەوی بووک گوێزانەوە.

**پەردە:** پەردوو، ژووری بووک و زاوا لە شەوی بووک گوێزانەوە.

**پەردەنیگار:** لە بری وشەی عربی شمائل دانراوە کە لە فارسیش هەمان شمایل بەکار ئەهێنرێ. پەردەیەکە کە نیگاری پیر و ئیمامان یان وێنەی مەیدانی جەنگ و پاڵەوانانی داستانی لەسەر کێشراوە. بە زۆری لەناو شیعەدا باوە کە دەروێش ئەو پەردەیە هەڵئەواسن و باسی کارەساتە ئاینیەکان ئەگێڕنەوە وەکوو کارەساتی کەربەلا و شەڕەکانی ئیمام عەلی، یان داستانی وەکوو حسێن کوردی شەبستەری و رۆستەم و زۆراب...

**پەرگەما:** بن شیرازەی بنی کڵاش بە مووی بزن کە هۆی لێک هەڵپێکانی بن و رووی کڵاشە.

**پەروا:** مەترسی، سام، باک، سڵ، خۆف؛ ئاوڕ، بایەخ.

**پەرەم:** پۆل، جوون، دەستە، کۆمەڵ.

**پەرێز:** جێگەی دەغڵی درواو؛ رەبەت، بۆسەی راوچی؛ بە دزە دزە بۆ نێچیر چوون.

**پەز:** مێگەلی مەڕ و بزن؛ یەک مەڕ، مێ.

**پەژاردنەوە:** کەفارە، تۆڵەی تاوان.

**پەژدێر:** هەل، دەرفەت، کێس، دەرەتان.

**پەژێران:** قەبووڵکردن.

**پەسا:** گیراوەی ئامادەکراو بۆ چێشت :: پەسای دۆڵمە، پەسای کفتە شۆربا.

**پەشمە:** هەرزە، باوە، قسەی بۆش E nonsense.

**پەککەوتە:** incompetent.

**پەلک:** لک؛ پێڵوو؛ کلی چاو.

**پەلێزە:** سوێسنە، سووسەن، لەیلانک، زەمبەقی زەرد، Orris.

**پەموانە:** تۆمەپەموو، دەنکی پەموو.

**پەمەتۆمە:** پەموانە، تۆمەپەموو.

**پەنابات:** نیوەی قەرانێک، دە شایی.

**پەنابردە:** کەسێکە پەنا ئەباتە بەر شوێنێکی ئاینی یان حکوومی بۆ ئەوەی خۆی بپارێزێ. ف بست نشستە.

**پەنگر:** مەقاش، ماشە، گیرە، پنگر.

**پەنەمیاگ:** پەنەمیاو، ئاوساو، کوتراو.

**پەی بگرێ:** شوێن بگرێ :: پەی گرتن.

پەیکوڵ: دەنکی گیایەکە بەقەد گەنمێک ئەبێ و دڕکاوییە، ئەلکی بە تووکی وڵسات و پاتاڵەوە.

**پێبەند:** کەفیل :: بووە بە پێبەندی باوکی: بووە بە کەفیلی باوکی؛ لە سەربازی پەڕییەوە لەبەر ئەوەی پێبەندی باوکە پیرەکەیەتی: واتە کەفیلی باوکیەتی.

**پێ پەلکە:** پێ پێ کردن لە شوێنی خۆ،

قاچ بە یەکا هاتن.

**پێنجی مارس:** Cinq–Mars لە بەرهەمەکانی ئالفرێد دو ڤینی.

**پێرک:** بەرزایی خۆڵ و بەردی کەوشەنی دوو زەوی بۆ لەسەر دانیشتن، ستێر.

**پێژان:** کاری پێژ: خشت پێژان، تەپاڵە پێژان.

**پێسترک:** پلیکان.

**پێشدەم:** پێشەنگ، پەیام هێنەر، دەم پێشخەر، کات پێشخەر.

**پێ مینبەر:** ڕەوزەخوێنی دووەم کە بۆ ڕەوزەخوێنی یەکەمی ئەسێنێتەوە.

**پێوار:** نادیار، نەدیار، غەیبی.

**پێوەر:** ئەندازە، پێوانە ف ع شاخص، ضریب.

**پیتر دەهۆخ:** Pieter de Hooch (١٦٢٩–١٦٨٤) شێوەکاری هولەندی، هاوچەرخی ڤێرمیر.

**پیتی:** دیزی، کیتەڵەیەکی گڵی بچکۆلانەیە ئاوگۆشتی یەک کەسی تیا ئەکوڵێنن.

**پیرانیزی:** Giovanni Battista (*also* Giambattista) Piranesi، هونەرمەندی دیزاینەر و میهرازی گەورەی ئیتالیایی کە دنیای ڕاستەقینە و قەبارەی ئاڵۆزی جیهانی خەیاڵ تێکەڵ ئەکا. (١٧٢٠–١٧٧٨).

**پیشکان:** بێڵەکان، پاچی هەڵکەندنی پیشۆک و کنگر.

**پیک:** چەکوشی قورسی ئاسن بەردی پێ ئەشکێنرێ.



**تاخ:** گەڕەک، بنە، زۆزک.

**تازیار:** باشتری و لەپێشتری، ئیمتیاز ع ف امتیاز.

**تاس بردنەوە:** واق و وڕ بوون، حەپەسان، سەر لە گێژەوە هاتن.

**تاشت:** بەرچایی، ژەمی بەیانی.

**تاقمانەجووت:** یاری تاق یان جووت.

**تا قەرانی:** یەک قەرانی.

**تالیافیکۆ:** Joseph Dieudonné Tagliafico (١٨٢١–١٩٠٠) گۆرانیبێژ و ئاوازدانەر.

**تاڵاو:** زۆنگ، خەم و پەژارەی زۆر.

**تامەزرۆیی:** حەزی دیدار، هەستی سۆز و خۆشەویستی :: تامەزرۆ: ئارەزوومەندی دیدار.

**تان:** ڕاهێڵی تەون :: تان و پۆ.

**تاناگرا:** ساڵانی ١٨٧٣–١٨٨٠ لە تاناگرای یۆنان، کۆمەڵێک پەیکەر دۆزرانەوە کە زۆربەیان ژن و مناڵ بوون بە توونیکی چیندار و ڕێک بۆ خوارەوە. ئەم جۆرە توونیکە زۆر زوو لە پاریس بوو

بە باو.

**تاوان:** جنایت :: کەتن و تاوان: جنحە و جنایت.

**تاوانبار:** ئەو کەسەی تاوانبارکراوە، تاوانی بۆ هەڵبەستراوە بەڵام مەرج نییە کردبێتی ف متهم.

**تاوانکار:** ئەو کەسەی تاوانی بەسەردا سەلمێنراوە ف مجرم.

**تاوڵەمە:** پۆلوو گەشێن، پیاڵەیەکە لە تێل دروووست کراوە زنجیرێکی باریک کراوە بە دەسکی، خەڵووزی تێئەکەن و هەڵی ئەسووڕێنن تا بگەشێتەوە.

**تایەن:** ڕەبەن، بەلەنگاز، بێتاوان، گوناح، هەژار، بەژماڵە.

**تخووب:** سنوور، سنووری نێوان دوو گوند.

**ترێ مارانە:** ڕێزەڵە، ترێ ڕێوی، forget–me–not.

**تریستان:** Tristan، پاڵەوانی چیرۆکی تریستان و ئیزۆڵد، کە ئەینرن ئیزۆڵد ڕزگار بکا و لە ئیرلەندەوە بگەڕێنێتەوە بۆ شا. تریستان و ئیزۆڵد هەروەها ئۆپێرا یان دراما مووزیکێکی ڕیچارد ڤاگنرە (١٨١٣–١٨٨٣).

**تریقانەوە:** پێکەنین بە دەنگی بەرز.

**تۆنگە:** شەربە، پارچی بلوورینی دەم پەلی مل باریک.

**تۆپز:** کوتەکی سەر بە بزمار یان قیر تێهەڵسواو :: بە تۆپزی: بەکەڵەگایی، بە زۆرەملێ.

**توخ:** تویژێکی زۆر ناسک؛ ڕەنگی تێر.

**توخ چوون:** پێست داماڵران، رووشان.

**توخ هەڵدان:** پێست هەڵدان.

**تۆر:** لاڵە پەتە، لاڵە پەترە ف الکن.

**تۆراخ:** ماستی ناو پێستە کە قەزوان و شویتی تێ ئەکرێ؛ خەستەتوورەکەی زۆر خەستی ناو مەشکە کە شیری تێ ئەکرێ و ڕائەژەنرێ بۆ ئەوەی شیر، تامی ماستە خەستەکە وەربگرێ، ئەوسا ئەیکەنە قاپ و نانی تێ ئەگووشن. خواردنی شوانانە.

**تۆرینۆک:** زیز، بێن تەنگ، دڵناسک ف زود رەنج.

**تۆڵا:** قورسە، لۆک، دارشتە، شمش.

**تۆڵاز:** سەرسەری، ژنباز ف مراهق.

**تۆڵانەوە:** کرووزانەوە.

**تۆمەت:** تاوانی پاڵدراو.

**توربەکێش:** توربە واتە کیسە و توورەکە، توربەکێش بەخزمەتکاری تەیبەت ئەوترێ کە ڕازدار و جێگەبڕوای خودانەکەیەتی.

**توربێن:** توورەکە، توبەرە، توورک.

**توێکاری:** Autopsy، ع تشریح الجثة ف کالبد شکافی.

**توێکنهام:** Twickenham، بنکەی کۆنت پاریس لە خولی یەکەمی تەرە بوونی لە ئینگلیس. پاش گەڕانەوەشی هەر وەک

بنکەی پادشاییخوازانی فەڕانسە بوو.

**توور:** لاڵە پەتە، لاڵە پەترە ف الکن.

**توورخە:** دەردەباریکەی زستانەی مەڕ و بزن.

**توورەکەرێژ:** بە توورەکەی خۆڵ شوێنێک پڕکردنەوە یان بەرزکردنەوە.

**تەپکە:** داو.

**تەبعکردن:** کەسێکە خواردنی چەوری پێناکەوێ و ناتوانێ هەرسی بکات و لە گەروودا هەست بە قورسی و تۆزانەوەی چەورییەکە ئەکا، نەتوانینی هەرسکردنی چەوری :: تەبعی کردووە: گەرووی بە چەوری هەرس نەکراو ئەتۆزێتەوە.

**تەبەرزین:** چەکێکی وەکوو تەور کە کاتی جەنگ بنی دەسکەکەی لە زینی ئەسپ گرێدراوە و شەڕی پێکراوە. دەروێش وەکوو سەمبولێک لەگەڵ کەشکۆڵ هەڵی ئەگرن.

**تەختی دێو:** یان کەڕەنای دێو، یان دووکەڵکێشی جنۆکە ئەو بەردانەن کە دەوریان گڵەسوورە و قسڵ بووە و لە رەوتی رۆژگاردا خۆڵ و قسڵیان لێ شۆڕاوەتەوە و وەکوو کۆڵەکەیەکی بەردینی سامناک ماونەتەوە، بە زۆری بەردێکی گەورەی تەخت لە سەر ئەم کۆڵەکانەیە و رواڵەتێکی وەکوو قارچکی پێ ئەدا.

**تەراد:** سمت و کەفەڵی یەکسم، پێستی سەر کەلەکە.

**تەرچک:** ناسک، شینکەی تەڕ و تازە.

**تەرخان:** کەسێک کە لە باجدان و تەمێ‌کردن پارێزراو بێ.

**تەردەست:** دەس رەنگین و چازان، چالاک و لەز.

**تەرەکاڵ:** بەرووبووی هاوینی پاش شەستە باران؛ بێستانی خەیار و ترۆزی و...

**تەشق:** تۆف، تۆفی سەرما :: بەتەشق: سەرمای تەزێنەر.

**تەشقەڵەباز:** فێڵەباز، گزیکەر.

**تەشک:** بەچک، بیچم، سیما، فۆرم :: تەشکی ئەندازەیی.

**تەشەنەسەندن:** metastasis.

**تەغاراو:** ئاو یان باراناوێکە لە شوێنی کەم ئاو لەسەر چاڵە بەرد کۆ ئەبێتەوە؛ ئاوی خۆشکردنی پێستە ف سنگاب.

**تەفرە:** فریو.

**تەکووز:** رێکوپێک، لەبار و بێ کەماسی.

**تەکەڵتوو:** جێگەی رانی سوار لەسەر زین.

**تەکین:** ئالپ تەکین دامەزرێنەری حوکمداریی تورکی غەزنەویان لە سەدەی دە و یانزەی زایینی کە خۆی لە خولامانی دەرباری سامانیەکان بوو.

**تەگە:** نێری، ساورێن، تەجە.

**تەلیس بەسەر:** سواڵکەر و گەدا لەبری

کڵاو و عابا پارچە تەلیسێک ئەدەن بە سەر و شانیاندا.

**تەڵبێژ:** لێدابڕاو، جیاکار، جیاواز، ف انتزاعی، منتزع.

**تەمار:** تارمایی بەرچاو، ڕەشایی بەرچاو.

**تەمراندن:** داپۆشین لە بن خاکدا.

**تەنگز:** چاڵووک، دارێکی باڵا کورتی دڕکاوییە، بەرێکی هەیە وەک چوالە، بەڵام تاڵە و ئەبێ خۆشە بکرێ بۆ خواردن.

**تەنگزە:** نەخۆشی ئاژاڵ ئەیدا لە دەم و لچ و گوانی بزن.

**تەنگژە:** تەنگانە.

**تەوژم:** گوژم، نهێم.

**تەنوورەکێشان:** لوول و پێچ خواردن و بەحەواداچوون.

**تەواڵ:** باڵندان.

**تەواڵە:** کەپری دوو قاتی لای مەرەزە کە گۆخلێ لێ ئەبێ.

**تەوجی:** باربۆ، یارمەتیدانی بە کۆمەڵ.

**تەوخ:** چەپەر، کوول، پەنای سەرگیراوی حەوانەوەی پەز. ف سم، جورا.

**تەوزە:** حەنەک، گاڵتەپێکردن. تەوس E satire.

**تەوزێنەر:** خەملێنەر، ڕازە، ڕازێنەرەوە، خەملوان.

**تەوەزەل:** تەمەڵ، لەش گران.

**تەوەق:** نەخۆشیەکی ڕەشەوڵاخ.

**تەوەنە:** کۆمەڵە.

**تەوەنەدان:** کۆمەڵەدان، تەموورەدان.

**تەیمان:** پەرژینی بە دار و شووڵ کە هەندێجار سواخیش ئەدرێ.

**تەیموور:** تەیمووری گوورکانی یان تەیمووری شەل، سەدەی چواردەی زایینی، لە تەتەرەکانی ئوزبەکستانە بەڵام هەوڵی داوە کۆلکەی خۆی بباتەوە سەر چەنگیزی مەغوول، توانی دەسەڵاتی خۆی بە کوشتوبڕ بەسەر ناوچەیەکی هەرە گەورەی ئاسیادا بسەپێنێ و حکوومەتی گوورکانیەکان دابمەزرێنێ کە لە ساڵی ١٣٧٠ تا ١٥٠٦ زایینی دەسەڵاتیان بەدەست بوو.

**تێرنێر:** Joseph Mallord William Turner (١٧٧٥ـ١٨٥١) وێنەگەری ئنگلیزی، بە کەسێک دائەنرێ کە هونەری بەرجەوەن کێشانی گەشە پێدا.

**تێکەڵە:** ئاوێتەی چەن شت پێکەوە وەکوو بەرد و لم و چەو.

**تێغە:** ناسک، دیواری ناسک، دیواری کاتی بۆ جیاکردنەوەی دوو شوێن.

**تێلماسک:** پارچەی باریک و درێژ، ڕووبان :: shoulder–straps واتە تێلماسکی سەر شان.

**تیانە:** مەنجەڵ، قازان.

**تیجیە:** پرشنگ، ترووسک، گەشە.

**تیر:** خەست 🄵 غلیظ.
**تیرەژە:** پەلکەزێرینە، پلوورە وارانێ.
**تیرەشان:** لاپاڵی کێو، لاشانی چیا.
**تیزماڵک:** فرۆزە، ڕۆشنی :: فرۆزەمند: صاحب حقیقت.
**تیسیان:** le Titien (١٤٧٧-١٥٧٦) وێنەگەری بە ناوبانگی فێرگەی ڤێنیزیا.
**تیشە:** سەردەرهێنانی چەکەرەی گەنم.
**تیمانج:** پێستی ئاژەڵی خۆشەکراوی دەباغ دراو.
**تیۆدۆر شا:** King Theodosius ئەماژەیە بە نیکۆلای دووەم، دواین تزاری ڕووس کە لە ئوکتوبری ساڵی ١٨٩٦ بە فەرمی سەردانی فەڕانسەی کرد.
**تیەپۆلۆ:** یان جامباتیستا Giovanni Battista Tiepolo (١٦٩٦-١٧٧٠) شێوەکار و چاپگەری ڤێنیزی، ڕەنگی شاد و زیندووی بەکار ئەهێنا، لە ئیسپانیا و ئاڵمانیش کاری کردووە.



**جاڕ:** کێڵگەی هەڵگیراو کە ئاژەڵی تێ ئەکرێ.
**جارس:** وەڕەز، قەڵس.
**جاڕدان:** قاودان، بانگەشە، هەواڵ بڵاوکەدنەوە.
**جامباتیستا:** یان تیەپۆلۆ Giovanni Battista Tiepolo (١٦٩٦-١٧٧٠) شێوەکار و چاپگەری ڤێنیزی، ڕەنگی شاد و زیندووی بەکار ئەهێنا، لە ئیسپانیا و ئاڵمانیش کاری کردووە.
**جامباز:** فێڵەباز، زیرەک 🄵 ارقە، ارغە.
**جامی جەم:** پیاڵەی جەمشید، جامی جیهان نما، جامی کەیخەسرەو کە زاناکان دروستیان کردبوو و حەوت جیهانیان تیا ئەبینی. لە ئەفسانەدا هاتووە کە جامی جەم، پیاڵەی سلێمان و ئاوێنەی ئەسکەندەر هەموو دنیای تیا بینراوە.
**جلشۆر:** دارێکی پانی دەسکدارە جلی پێ ئەکوتن بۆ ئەوەی کەف هەڵبخا و چڵکی لێ ببێتەوە.
**جڵەودار:** کاروانسالار، سەرپەرشتیاری کاروان، پێشرەوی کاروان.
**جمابوو:** جووڵابوو :: لە جمین: جووڵان، ڕاشەکان، لەرزین.
**جۆرجۆنە:** Giorgio Barbarelli da Castelfranco (١٤٧٧-١٥١٠) شێوەکاری ڕێنسانسی دووەم High Renaissance لە ڤێنیزیا کە تەنها سی و دووساڵ ژیا.
**جووتبەندە:** bondman، ڕەعیەت، بەندە، جووتیاری بەستراوە بە زەوییەوە.
**جەبە:** جەبە: جیاواز و تایبەتی نەک ئاسایی 🄵 🄴 استثنائی.

**جەغز:** نیوبازنە.

**جەنجەڕ:** ئامرازی لە دار و ئاسن بۆ گێرەکردنی کلۆش؛ چەرخ و دۆڵچەی ئاوهەڵکێشان.

**جەندەرمە:** ئەمنیە، ڕۆمی، قۆڵچی.

**جەوەنە:** مەشکەی ئاو.

**جێ نشینەکان:** Regents بەرهەمی فرانس هاڵز Frans Hals شێوەکاری هولەندی.

**جیر:** لاستیک، کەژ، لاسیق.

**جیفە:** پارە، دارایی.

**جێوبان:** جێگە و بان. لێفە و دۆشەکەی قەدکراو لە ناو مەوجدا.



**چاخ:** قەڵەو.

**چارەکە:** چارۆکە، قوماشێک کە ژنان بەسەر شانیدا ئەدەن.

**چاکی:** گۆڕی پیر و مەشایخ، گۆڕی پیرۆز و پاکیزان.

**چاڵووک:** دەوەنە دڕکێکە گوڵی سپی ئەگرێ، کاوێر، تەنگز.

**چاو بادامی:** ئەوانەی چاویان وەکوو ئەو مەنگول و تەتارانەیە کە نموونەیان لە ناوچەکە ماوەتەوە، چاوخوار، چاولار.

**چاومارە:** سپەراگۆس، شەفەلە، کەبەر، گیاماران.

**چاوشۆڕ:** شەرمەزار.

**چاوەش:** دەهۆڵ و زوڕناژەن؛ پێشەنگی لەشکر و پێشڕەوی کاروان.

**چاوی:** زمانی چاوی، زمانی زەرگەری، زمانی سەرگەڕ :: زەزە، مەزە، ئەزە، نەزە.

**چڕەبەندان:** لە دەور یەک خڕبوونەوە، گۆرانی وتن و بەزم گێڕان؛ پڕایی، ئاپۆرە.

**چزڵێک:** بەزی هەڵقرچێنراو.

**چگوور:** ئامێرێکی مووسیقایە لە خێزانی تار، جۆرێک تەمبووری ساکار، دوو ژێی هەیە.

**چڵەگە:** ئەستوندەک.

**چڵەبەنان:** ڕەشماڵی شان بە شان، ریزە خێوەت کە سنگیان هاوبەشە.

**چناران:** گوندێکە لای نەیشاپوور.

**چۆرتم:** نەگبەتی و خەفەت و نەهامەتی.

**چۆڕە:** دەڵاندنی ئاو بە چۆڕەچۆڕ.

**چواربۆر:** Guillemot (فەڕانسەیی) جووت کەوانی بچووک بۆ نوسینی قسەی وەرگیراو لە نێوانیان دا ::هێمای چواربۆر «». نیشانەکانی خاڵبەندی:

**خاڵ** ⟵ .

**جووتخاڵ** ⟵ :

**دابڕ** ⟵ ،

**خادابڕ** ⟵ ؛

**خاواق** ⟵ !

**تەقەڵ** ⟵ ...

**کەوانە** ⟵ ( )

**کەوانەی گۆشەدار** ⟵ [ ]

**چواربۆر** ⟵ " " **یان** ⟵ «»

**چوارپیل:** چوارشانە، ناوشان پانوپۆڕ.

**چواردە مەعسووم:** شێعەی دوانزە ئیمامی، حەزرەتی محەمەد و فاتمەی زەهرا لەگەڵ دوانزە ئیمامەکە بە چواردە مەعسووم ئەزانن کە هەموویان خاوەنی فرۆزەی عیسمەتن واتە بەدوور لە هەڵە و پاکیزەن.

**چوار کوڕانی ئەیمون:** ☜ سەن تیۆفیل.

**چوارهەنگڵ:** چوارشانە و کەتە، زیاتر بۆ ئەسپ بەکار ئەهێنرێ مەگەر ئەوەی ئەماژە بێ بە مرۆڤێکی زەبەلاح.

**چورت:** ئامرازی حیسابکردنی دوکانداران؛ سەرخەو، سووکەخەو، وەنەوز.

**چە پاوگەر:** تالانکەر.

**چە پخوون:** شەوشالاو، پەلاماری شەوانە ف شبیخون.

**چە پەر:** دەرگای بەهاربەند، کەپری لە شووڵ و دار؛ سەنگەر، سپێر؛ تەوخ.

**چەشە:** ئەو دانەی راوچی بۆ نێچیری رۆئەکا ف طعمه.

**چەرمەڵە:** سپیکەڵانە؛ چەرمەڵ، دۆکەی میوە، شۆکە ف سپیدک درخت و پالیز.

**چەفت:** لارولەویر، ناقۆڵا.

**چەق:** وردە رەگ؛ ناوەند.

**چەلەنگ:** شۆخ و شەنگ؛ چوست و ئازا.

**چەلەنگەر:** تەنەکەساز، تەنەکەچی :: چەلەنگ: تەنەکە پووتی.

**چەمەری:** هەوای چەمەری هەوایەکی زۆر کونی کوردییە و وتراوە لە سەردەمی هێرشی یۆنانیەکان بۆ کوردستان هەبووە، ئەوسا کە گەزەنفوون باسی مووسیقی کورد و کەڵک لێوەرگرتنی مووسیقی ئەکا لە لایەن کوردەکانەوە، تەنانەت لە جەنگیش‌دا؛ هەوایەکی غەمگینە کە دانیشتوانی زاگروس کاتی پرسە و کۆست کەوتن ژەندوویانە؛ چەمەری وەکوو «نوحە خوانی» لە ناو فارسەکاندایە کە خۆی لە «نوحە»ی ئیسلام و عەرەب وەرگیراوە؛ چەمەری نواندنەوەی کۆست و پەژارەی خەڵکی کوردە لە چوارچێوەی مووسیقی‌دا.

**چەو:** وردە بەردی تیژ و نەسواو :: چەوریژ.

**چەوماڵ:** دۆڵەساو، خاوێنکردنەوەی لیتە و هەرگی بیر و کارێز.

**چەوی و بورغوو:** مۆرە و پێچ.

**چیت:** قوماشێکی ناسکی لۆکە بە گوڵی ورد یان درشتەوە.

**چیچکان:** قنچکان، هەڵتروو شکان.

**چیرۆک:** سەربردە ف آوسنه.

**چێوپەمە:** داری پەموو.



**حوسەینا:** لە شاعیرانی چوارینەبێژی نەزۆر کۆنی باشووری خوراسان کە زۆربەی چوارینەکانی بۆ دڵدارەکەی بەناوی دلارام وتووە. شیعرەکانی دەماودەم گەڕاوە.

**حەجمان:** بەرگە، تاقەت، گریک.

**حەزناڵە:** هاوارکردن و نالین بە حەز و خۆشیەوە.

**حەزیا:** شامار، ئەژدیها، حەفیان، زەها.

**حەسەنی سەباح:** ☜ سەباح.

**حەفیان:** شامار، ئەژدیها، حەزیا، زەها.

**حەلاج:** ☜ مەنسووری حەلاج.

**حەلیم:** خواردنێکە لە گەنم و گۆشت کە کاتی کوڵان بەردەوام لێکی ئەدەن تا ئەو کاتەی گۆشت و ساوەر تێکەڵ ئەبێ و خەست ئەبێتەوە. کاتی خواردن رۆن و دارچینی ئەکەن بە سەردیدا. حەلیمی شاری سنە بەناوبانگە کە هەندێ چێشتخانەی تایبەت لە مەنجەڵی مەزندا لێی ئەنێن و بە کەوچکێکی گەورەی دار مای ئەهێننەوە.

**حەمبەل:** تاقمی ڕاست و چەپی فیشەکدان، قردێلەی سەرشانی ف حمایل.

**حەنەک:** گەپجاڕیی، گەمە و گەپ.

**حەوا:** گشێوش، بۆشایی، ڤالایی ع ف فضاء.

**حەوتەوانەی کەلان:** ف دب بزرگ، ع الدب الاکبر.

**حەوتەوانەی گچکە:** ف دب کوچک، ع الدب الاصغر.

**حەفت ئەورەنگ:** حەوتەوانە ع بنات النعش.

**حەوشەمەڕ:** پەچەی مەڕ، خەلان، شوێنی کار و بەرخ.

**حەیدەرخان:** حەیدەر عەموو ئۆغلو، ساڵی ۱۸۸۰ ز لە شاری سەڵماس لەدایک بووە. لە گورجستان بووە بە ئەندازیار و ئەندامی پارتی سووسیال دێموکراتی رووسیە، هاوڕێ و هاوخەباتی لنین بوو. دامەزرێنەری یەکەم پارتی کومونیستی ئێرانە لە جوونی ۱۹۳۰ زاینیدا. حەیدەر خان توانی لەگەڵ میرزا کووچک خانی جەنگەڵی رێ بکەوێ و لە ماوەی حەوت مانگی کۆتایی بزووتنەوەکە، نەک هەر خۆی بەڵکوو بە چەک و تەقەمەنی یارمەتی بزووتنەوەی جەنگەڵی دا. کێشەی نێوان سەرکردایەتی بزووتنەوەی جەنگەڵ بوو بە هۆی کوژرانی.

**حەیزەران:** قامچی یان چێوتالیمی دەستی ئەفسەرەکان، حەیزەرانێکی ناسکە و بە سیرمەی چەرم چنراوە و دوو گەڵا چەرمی باریک وا بە نووکەکەیەوە.



**خاپێنراو:** فێڵ لێکراو.

**خاپینۆک:** رازاوی، گوماناوی.

**خاتوونه:** ماسییه کەشینە ف قزل ئالا، trout.

**خاچ تێروانین:** راستەوخۆ و بە مۆرەوە تێروانین.

**خاراو:** راهاتوو لەگەڵ کار، دنیا دیدە، بەرگەگری سەختی.

**خازەڵۆک:** گەدا، سواڵکەر.

**خاک و پاک:** ئاشت و تۆراو؛ خاک بوون دارەتی تۆران و پێکەوە نەدوان، پاک بوون دارەتی ئاشتی و پێکەوە دوانە :: خاکی کرد لەگەڵی: لێی تۆرا و قسەی لەگەڵ دابڕی.

**خاکەڕایی:** مل بەکوێن بوون، بێ دەماری ف تواضع.

**خالایی:** لاکەلەکە.

**خان:** نازناوی پیاوی دەسەڵاتدار.

**خاوبەستن:** خاوکردن و بە هەڵەدا بردن؛ کڵاو سەرنان :: خاوی تۆیان بەستووە.

**خاوە:** پیتاکی میری؛ کەرانە، قەرەبووی مامەڵە پەشیمانی؛ سەرانە بۆ گەڵەگا و زۆردار؛ لکی تازە رواو لە لق.

**خرت:** نێری، بزنە نێری دووسالان.

**خزن:** گۆڕی پیر و مەشایخ، گۆڕی پیرۆز و پاکیزە.

**خمگەر:** رەنگرێژ.

**خۆبانی:** نائومێد بوون، دڵسارد بوونەوە، دەستخەڕۆیی ع تثبّط، احباط ف سرخوردگی، disappointment.

**خۆحەن:** راستەوخۆ ف مستقیم.

**خۆرا:** بۆ خواردن شیاو.

**خۆماک:** خۆڕسک، غەریزە.

**خۆیا:** دیار، ئاشکرا، دەرکەوتن و نواندنی بیچم و کەسم.

**خۆیان:** کا و گەنمی تێکەڵ پێش شەن کردن.

**خواجانە:** دوو سەکۆ لە هەر دوو بەری دەروازە.

**خواجە:** پیاوی خەسێنراو، پیاوی گون دەرهاتگ.

**خودان:** خێو، خاوەن.

**خوڕڕەمدین:** بابەکی خوڕڕەمدین، سەدەی نۆی زاینی، لە ناوچەی ئەدەبیل، سەرکردەی شۆڕشی رزگاریخوازانەی دژی عەباسیەکان بوو کە ماوەی بیست ساڵان بەردەوام بوو. خوڕڕەمدینان بە بەرگ سوور بە ناوبانگن بەو جۆرەی کە پەیرەوانی ئەبوموسلیمی خوراسانی بە بەرگ رەش ناسراون. ئایینی خوڕڕەمدینان کە خۆی بە واتای بەهدینە، ئاوێتەیەکی زەردەشتی

و مەزدەکی بووە.

**خوشین:** خزین و ڕێکردنی مار.

**خومار:** کەسێ کە دوای نەشەبوون و سەرخۆشی سەری ئێشێ.

**خومخوم:** دەنگی ئاو کە بە ڕووبار و جۆگەدا ئەڕوا؛ شۆخ و شەنگ.

**خەپرەکردن:** لێک ئالان و بەناو یەکدا هاتن و چوونی مەڕ و بزن، کاتێکە بە هۆی دیاردەیەکی سروشتی وەکوو با و تۆز و برووسکە و وردە بارانەوە قەلس ئەبن.

**خەرابات:** وشەی خەرابات، واتایەکی بالای هەیە و ئەمازەی بۆ یەکبوونە، ئەو شوێنەی وا عارف تێیدا خەریکی گەڕانە و بۆ پلەی بالای ون بوون، کالبوونەوە، نەمانی هەموو نەخش و ڕوالەتە ڕوالەتی و نا خوداییەکان تێ ئەکۆشێ. لە فەرهەنگەکاندا ئەم واتانەی بۆ نووسراوە: مەستی بێ ئاگا، سەرخۆشی بادە، مەستی مەست، مەیخانە، دنیای کەلاوە، کاولستان، دنیای بێوەفا. شاعیرە مەزنە کلاسیکیەکانی کورد شارەزای فەلسەفە و چەمکی خەرابات بوون و لە شیعرەکانیاندا باسی خەراباتیان کردووە:

ئەحمەد موختار جاف

**لە عەشقی خووبڕوویان مەنعی من هەرگیز**
**مەکە واعیز ـ بە دەستی خۆم نییە بەخوا**
**ئەمە دەردێکی زگماکە**
**بەلێ بازاڕی دەهرە وا یەکێ سۆفی یەکێ**
**شێخە ـ یەکێ جێگەی خەراباتە، یەکێ**
**بێهۆشی تریاکە**

دیسان ئەحمەد موختار جاف

**زاهید وەرە ناو بەزمی حەریفانی خەرابات**
**ـ لادە لە ڕیا و سەرزەنشی قۆڕ و خەرافات**
**یەک جورعە بنۆشە لە مەیی بێ غەش**
**و گولڕەنگ ـ ئەسلەن مەکە تۆ بەو**
**پڕوپوچانە موبالات**

مەحوی

**شوکر هۆشیارە مەحوی، تێدەگا دنیا**
**خەراباتە**
**کە بەدمەستی بکا ئەهلی، خراپەی بۆچی**
**لێ دەگرم**

دیسان مەحوی

**شوکری حەق بەر دەری هەر فەقرە**
**ئیقامەتگاهم ـ بەر دەر و باری نە سولتان**
**و نە شا نیمە مەلاژ**
**بەلکە لەو ڕێیەوە من پەی بەمە عیمرانی**
**بەقا ـ مەحویا غەیری خەراباتی فەنا نیمە**
**مەلاژ**

شامی کرماشانی

**خەرابم کرد خەرابات خەیالت**
**وە دەس چود عەقل و ئیمانم ، ولم کە**
**وە بادەی تەلخ جام زندەگانی**
**دەمێ مەست و غەزەل خوانم، ولم کە**

لە شیعری فارسیدا، حافزی شیرازی

یەکێکە لەو کەسانەی خەرابات و هەموو ڕەهەند و لایەنەکانی ئەم دیاردە عیرفانیە پێکەوە ئەنوێنێتەوە:

**یادی ئەو یارە پیالەی هەڵئەدا لە بەزمی یاران**

**یادی ئەو بەزمە من و یار و، خوا بەلاّم لامان بوو**

**یادی ئەو کاتە خەرابات نشین بووم و مەست**

**ئەو شتەی لێرە لە مزگەوت کەمە لام لامان بوو**

دیسان حافز

**من بە یادی لێوی ئەو چوومە خەرابات دوێشەو**

**دیم هەشی مەی دڵی پڕ خوێن و لە ژێر پێی گڵ بوو**

**خەروار:** کێشێکە بەرامبەر بە سێسەد کیلۆ.

**خەڕۆ:** لەخۆ بایی، دفرە، خۆدەرخەر :: دەستخەڕۆ: فریودراو، فێڵ لێکراو.

**خەڕۆبوون:** لەخۆ بایی بوون، لەخۆ دەرچوون.

**خەزیمۆک:** گوڵە مرواری، بەیبوٚن، daisy.

**خەسرەو:** یان خەسرەوی نەوشیروانی دادگەر لە پادشایانی بە دەسەلاّتی ساسانی سەدەی شەشەمی زاینی ☜ ئەنووشە.

**خەسەتوورەکە:** ماستی لە کیسەکراوی ئاوەچنکراو.

**خەفتیان:** ساردە پایز.

**خەلان:** کۆز.

**خەلەساو:** (خەلەسان) لە خەم ڕەسیو، نەخۆشێک کە قەیرانی نەخۆشیەکەی تێپەڕاندبێ و بەرامبەر بەو نەخۆشیە پارێزراوی پەیدا کردبێ ف مصونیەت ع مناعة، حصانة E Immunity.

**خەڵخاڵ:** کە تا کۆتایی ڕژیمی پەهلەوی پێی ئەوترا هێرۆئاوا، لە شارەکانی پارێزگای ئەردەوێڵە کە زنجیرە چیای تاڵش لە دەریای مازەندەران جیای ئەکاتە، دانیشتوانی بە زمانی ئازەری و تاتی و کوردی قسە ئەکەن، بە تایبەتی شارۆچکەی لەمبەر و گوندەکانی دەوروبەری کە هەموویان کوردن.

**خەم:** پێچ؛ ران :: رانی ڕاست، لنگی ڕاست.

**خەنازیر:** کوانی زل کە لە مل دێ، دمەڵی گەورە.

**خەنجەری مالاّیی:** Malayan kris، خەنجەرێکی قۆرتداری مارئاسایە.

**خەنیم:** هاوتای کەسێک لە زۆرەبان و ڕکەبەرایەتی و پێشبڕکێدا.

**خەور:** لێڵ، تەماوی.

**خەوگەڕ:** ئەو کەسەی بەدەم خەوەوە ئەڕوا بەرێدا.

**خێرته:** بەیاری هەرگیز نەکێلراو.

**خێشاندن:** تەمەڵی کردن، دواخستن، وەدەرنگ خستن.

**خێسه:** مۆرە، بە گۆشەی چاو روانین بە تووڕەیی.

**خێورانەوە:** توانەوە، سوێ بوونەوەی دڵ.
ئەم دارەتە پەیوەندی بە باری دەروونی مرۆڤەوە هەیە، نەک ئازاری جەستەیی.

**خیا:** یخ؛ یخدانی وشتر.



**دابڕانێ:** کێبەرکێ لە گوریس کێشاندا.

**داتەکاو:** بریتی لە والآبوونی کیسە و شەڵتە بە هۆی راوەشاندنەوە و لە هەمان مایەدا واتە لەڕ و لاواز بوون و گۆشت بە لەشەوە نەمان و هەڵوەرین.

**دادنووس:** notary.

**دادەوییە:** رووزبێهـ کوڕی دادوییە ناسراو بە ئیبنی موقەفەع لە نوێنەرانی بیرکردنەوەی زانستیە لە سەدەی هەشتی زاینی، بۆ سەرکەوتنی زانست و مرۆڤ دژی خوراڤاتی دینی، کە ئامێرێکی گرنگە بۆ یەخسیر کردنی گیان و بیری جەماوەر، خەباتی ئەکرد و گومانی لە هەموو ئاین و ئاینزاکان هەبوو. هەر ئەم ئازادیخوازی و جەربەزیەی لە دەربڕینی بیر و باوەڕدا بووە هۆی ئەوەی مەنسووری عەباسی بەناوی کافر و زەندەقە، فەرمانی کوشتنی بدات.

**دارا:** یان داریووشی سێیەم، کوڕی داراب، نەوەی داریووشی دووەم، دوا پادشای ماد، سەدەی چواری زاینی ☜ داریووش.

**دارد:** Damn، بە واتای قوزەڵقورت، دەرد، ژان، ژەهری مار، نەفرەت کە زیاتر مناڵ بە یەکدی ئەڵێن.

**دارماڵ:** تەواو، کامل.

**دارانەوە:** بوورانەوە، حاڵ لێهاتن ع خلسە.

**داروازێ:** سەمای یاریکردن بە دار.

**دارو پەردوو:** لاوار، بەرد و دار و هەڵاشی خانووە رووخاو ف آوار.

**دارەبەن:** دارەڕای خانوو؛ داری قەزوان.

**دارەت:** دۆخ، ژیوار، حاڵ، حاڵەت :: ئەو دارەتەی بەسەرم هاتبوو، لە دارەتێکدا بووم.

**داریووش:** داریووشی مەزن، لە پادشایانی بە دەسەڵاتی ماد. سەدەی شەشەمی پێش میلاد. فارس، بە پادشای هەخامەنشی ناوی ئەبا، لە کاتێکا خۆیان دان بەوەدا ئەنێن کە هەخامنشی درێژەی مادە. باپیرەی داریووش ناوی هەخامەنش

یەکێک لە سەدان سەرداری ماد بوو. بەڵگە بۆ ماد بوونی داریووش، یەکێک لە کۆنترین سەرچاوەکان، **تەوراتە**. لە تەورات دا زیاتر لە سی جار ناوی ماد و داریووش هاتووە و، تەنها جارێکیش باسی هەخامەنشی تیا نییە. بە تایبەت لە لایەن دانیاڵی نەبی کە خۆی کاربەدەست بووە لە داموودازگای داریووش دا. تەورات، کتێبی دانیاڵ نەبی، بەشی ٦، ئایەتی ٣١ ئەڵێ: «**داریووشی مادی** ئەوسا کە سێ بیست و دوو ساڵ تەمەنی بوو، خاکی کەلدانی گرت و بوو بە پادشای ئەوێ.» هەمان سەرچاوە بەشی ۹، ئایەتی ١ ئەڵێ: «لە یەکەم ساڵی دەسەڵاتی داریووشی کووڕی ئەهاسووریۆس لە **تۆوی مادەکان**، کە بوو بە پادشای خاکی کەلدانیان.» جا ئەگەر داریووش ئەگەر فارسە، بۆ پێی ناڵێن لە تۆوی فارس؟ هەمان سەرچاوە، بەشی ١١، ئایەتی ١ ئەڵێ: «**داریووشی مادی** و...» ئەگەر حکوومەتێک لە ئارادا بووایەت بە ناوی هەخامەنشی دیارە پێویست نەبوو بڵێن داریووشی مادی، چونکە وەک فارس ئەڵێ ئەوە سەد و ئەوەندە ساڵە ماد تیاچووە، بۆ ئەبێ بنووسن ماد و مادی. ئەویش کەسانێک کە خۆیان راستەوخۆ کاریان بۆ داریووش کردووە و زانیویانە کاریان بۆ کێ کردووە. هەروەها ئەوەش ئەزانین پادشاکان و حکوومەتەکان چەندە سوورن لەسەر ناو و نیشان و بنەچەی خۆیان.

**داژدار:** لایەنگر.

**داسووکە:** قەڵاس، دەسک، گوڵە گەنم کە لە دەمی داس دائەکەوێ.

**داگرتبێ:** خشاردبێتەوە :: خۆداگرتن: خۆ شاردنەوە.

**دامەزراوی کاراگایی:** firm of inquiry agents یان وەک ئەمڕۆ ئەڵێن Detective Agency. واتە بنکەی پشکنین و لێکۆڵینەوە کە (کار ئاگان) واتە ئەزانن چۆن تۆژینەوە بکەن.

**دانشێف:** Les Danicheff شانۆگەری کۆمێدی ئەلکساندر دۆمای کوڕ، ١٨٧٦.

**دانکە:** هاوڵەی ئاژەڵ کە جەرگی دائەرزێنێ.

**دانەگیرێ:** دانەچییرە.

**دخۆ:** کوێخا، قێخا.

**ددان لە چیرەوە هێنان:** ددان چیر کردنەوە.

**درژ:** تووڕە، گرژ؛ مات و کڕ.

**درکە:** کنایە.

**درم:** ئاهۆ، پەتا، نەخۆشی گیرۆ.

**درێخ:** ئەفسووس، تاسە، ئەسەف.

**دردۆنگ:** دوودڵ، بەگومان.

**دڕنی:** بۆنی گرانی لەش؛ بۆنی تەگە لەکاتی

تێبەردانەدا؛ بۆنی ماسی.

**دشت:** دزێو، کرێت، کەسن.

**دفرە:** لەخۆبایی، لووتبەرز، خەرۆ، غورروور.

**دکتور:** ئەمازەیە بە دکتور **تەقی ئەرانی** کە ١٩٠٣ی زایینی لە تەوریز لەدایک بووە. ئەرانی دوکتۆرای شیمی لە ئاڵمان، کومۆنیست، ئەندامی یەکەم حیزبی کومۆنیستی ئێران بە سەرۆکایەتی حەیدەر عەموو ئوغلوو، ئەندامی بەرجەستەی گرووپێک بوو کە ساڵی ١٩٣٦ لە تاران گیران و زیندانی کران. ئەو کەسانە هەرچەن پێش گرتنیان پەیوەندییان پێکەوە نەبوو بەڵام لە زیندان بە گرووپی پەنجا و سێ کەس ناوبانگیان دەرکرد. گۆڤاری دنیا یەکێکە لە بەرهەمەکانی خەباتی ئایدیۆلۆژیکی ئەرانی. ڕۆژانی دە تا پانزەی ڕێبەندانی ساڵی ١٣١٨ی کۆچی بەرامبەر بە مانگی یەکی ١٩٣٩ی زایینی ئەرانی نەخۆش کەوت و ڕۆژی پانزە بە شێوەیەکی گوماناوی لە زیندان کۆچی دوایی کرد. ئەرانی دەرمانخوارد کرابوو و ڕێگە بە دکتوری زیندان نەدرا تیماری بکات. **بوزورگی عەلەوی** هاوڕێی ئەرانی پەرتووکێکی بەناوی «پەنجا و سێ کەس» نووسیوە. **شاملوو،** شیعرێکی درێژی بەناوی «قەسیدەیەک بۆ مرۆڤی مانگی ڕێبەندان» لە پەسنی ئەرانیدا هۆنیوەتەوە.

**دگەر:** بێگانە، نامۆ، غەوارە، نامەحرەم.

**دگەرشێوە:** شێوەگۆڕان، پەرەسەندن، metamorphosis، وەک گۆڕانی کەوچکە قوڵە بۆ بۆق.

**دلاوا:** بەخشندە، دەسکراوە.

**دلاوەدان:** بەهۆش، وریا، زۆرزان.

**دۆخەوا:** دۆکوڵیو.

**دۆش:** دژ، مات، کز.

**دۆشدامان:** دژدامان، مات و کز بوون.

**دۆشەکلە:** دۆشەکی پچکۆلانە.

**دۆڵ:** سوێنە، تەغار.

**دۆلاڤ:** ئاوبارە، پلوسکی ئاوبەر.

**دۆلکە:** تەغار، کەپوولە، کیل.

**دۆڵەساو:** چەوماڵ، خاوێنکردنەوەی کارێز.

**دوانزە ئیمام:** شێعەی دوانزە ئیمامی بڕوایان بە دوانزە ئیمام هەیە کە ئەمانەن: عەلی، حەسەن، حسێن، سەججاد، محەمەد باقر، جەعفەری سادق، مووسای کازم، ڕەزا، محەمەد تەقی، هادی، حەسەنی عەسکەری، حوجەت کوڕی حەسەن.

**دوت:** کچ، یار، خۆشەویست.

**دودۆنا:** Dodona شارێکی کەونارا لە یۆنان، پرستگەی زیۆسی لێبووە، لە

تەنیشتییەوە جەنگەڵێک بووە کە پیران و کاهینان ووژەی بایان لە ناو دارەکاندا بە دەنگی خوا زانیوە و لە سەر بناغەی ئەوە پێشگۆییان کردووە.

**دوژمنکام:** کەسێکە لاواز بوونێ و بار و دۆخی بەدڵی دوژمن بێ؛ بە کامی دوژمن.

**دوشێس دو ساگان:** Anna Gould (١٨٧٥-١٩٦١) هاوسەری دووک دو ساگان.

**دوکلێڤ و ڕێنە:** Princesse de Clèves ڕۆمانی دولافایت (١٦٣٤-١٦٩٣) بەرداشتێکی کلاسیک و ئاریستۆکراتی عەشقە، لە کاتێکدا René شاتۆبریان (١٧٦٨-١٨٤٨) وەک یەکێک لە باشترین نموونەی عەشقی ڕۆمانتیک ناسراوە.

**دوێرد:** دواردی، مقەست، قەیچی.

**دووک دو بروولی:** Victor de Broglie (١٧٨٥-١٨٧٠) وەزیری دەرەوە و سەرەک وەزیرانی فەڕانسە (١٨٣٣ تا ١٨٣٦).

**دووک دو پاسکی:** Étienne-Denis Pasquier (١٧٦٧-١٨٦٢) نووسەر و سیاسەتمەدار.

**دوومان:** تەم و مژی سەر کێوان، توومان.

**دەخەسی:** خۆراگر، دەروونداڕ.

**دەدەری:** سەربەردە، جیوەلەک، یارەمەز، ماڵانگەڕ ف هرجایی.

**دەربایس:** پەرۆش، گرنگی :: دەربایس نایەت: لای گرنگ نییە.

**دەربیچە:** دەلاقە، وەنەدی.

**دەردەست:** accessible ع متواجد ف دست یافتنی.

**دەروو:** ڕەهۆڵ و ڕێچکەی دەرباز بوون؛ دەرگای خێر و خۆشی.

**دەروونددەر:** دەربەدەر، ئاوارە.

**دەروونددەری بەراوەژوو:** ئاوارەی خاوەن جێگە، خاوەن جێگەی بێپایە، دامەزراوی جێنەگرتوو، جێگرتووی دانەمەزراو.

**دەرەلنگ:** دەلینگ، ئەو بەشە لە لە شەرواڵ کە بەلەکی پا دائەپۆشێ.

**دەریزان:** ئاستانە، ئاستانەی دەرگا.

**دەژ:** maiden، کچ، کێژێک کە پیاوی نەبینیوە، دەست لێنەدراو ع عذراء ف باکرە.

**دەستخاڵە:** دەسکاڵە، جۆرێک داس.

**دەستم لێ مەدە:** Noli me tangere. «دەستم لێ مەدە، کە لە **ئینجیلی کوردی، یۆحەننا، بەشی بیست**، ١٧دا هاتووە: «مەم گرە! هێشتا نەڕۆیشتووم بۆ لای باوک، بەڵام بڕۆ بۆ لای براکانم و پێیان بڵێ: من دەچم بۆ لای باوکم و باوکتان، خودام و خوداتان!» یەکەم قسەی عیسایە بە مریەمی مەگدەلین.

**دەستەک:** دەفتەر، دەفتەری گەورە؛ ئاڵوودار؛ ریزە دێراوێک.

**دەستەکەوشە:** دەستگیرەی ئاموور لە جووتکردندا.
**دەستەجلەو:** پەتی لەغاوی ولْسات.
**دەستەوەرە:** دەستەبەرە، ناوەی قورکێشان، برانکاردی نەخۆش گواستنەوە.
**دەسخەرۆ:** خەڵەتاو، فریودراو.
**دەسرۆکە:** چارۆکە.
**دەسک:** ئەو گوڵە گەنم و جۆیەی لە دەمی داس هەڵئەوەریّ، قەڵاس، داسووکە :: دەسکچن، دەسک چنینەوە، دەسکەوان.
**دەسکەوان:** قەڵاسچن، ئەو کەسانەی بەدوای دروێنەواندا گوڵە گەنم یان جۆی لەداس بەجێماو، واتە دەسک یان داسووکە کۆئەکەنەوە.
**دەسەندە:** بەخشش، قەززدانەوە بە بەش بەش :: بەرتیلی سووکەڵە و کەمبایی.
**دەستەندەخۆر:** ئەو کەسەی بە بەرتیلێکی سووکەڵە و کەمبایی خۆی ئەفرۆشیّ، مرۆڤی چرووکی چاوبرسی.
**دەقل:** تم تمان، زەوی رەق.
**دەگ:** mast، کاریتە یان دیرەکی چارۆکەی کەشتی.
**دەگە:** فێڵ، گزی :: دەگەلێدان: لە پشتەوە خەنجەر لێدان، فێڵکردنی ناجوامێرانە.
**دەلمە:** بالاپۆشی پێش ئاوەڵە، جبە.
**دەلی:** دەلوو، دەلۆ، شێت، دێوانە.
**دەڵپ:** فرەوان، هێڵ و هەراو، گەورەتر لە ئەندازەی پێویست.
**دەڵەک:** خەز، قاقوم، جۆریّ گیانداری خەزدارە پێستە تووک نەرمەکەی ئەکریّ بە فەرو.
**دەماخ‌پرواو:** پەست بوو، زۆر وەڕەز و جاڕس.
**دەمبر:** چەقۆی پینەچی، گۆترە.
**دەمبێن:** دەمبەست، دەمامکی دەمی گا و ئەسپ کاتی گێرە کردن.
**دەمخەندە:** خەندە و پێکەنینی زۆر کورت.
**دەمچەپلە:** کەسیّ کە خێرا قسە ئەکات و دەم بە یەکدا ئەدات.
**دەمسوور:** شەڕانی، جینگن؛ بوێر؛ پێداگر لە سەر کار.
**دەمنە:** دار جگەرە، مۆدنە.
**دەمووکانە:** mistletoe گیایەکە لە تیرەی هەڵاڵە، گوڵەکەی بەنەوش و سپی هێشوویە.
**دەمەسات:** ساتەوەخت، دەمێکی تێپەڕ و کەم ماوە، سات و دەمێک.
**دەوەن:** پنچک.
**دەوەن بە ئاش:** کێشەی بیّ‌سوود.
**دەوێل:** سیرمە، سیرمەی بەستنی ملی مەشکە.
**دێبەر:** رۆژە جووتێکە لە زەوی.
**دێکادن:** decadent بە واتای لادەر،

ئەندامی شێوازی سەر بە بزووتنەوەی هونەری Aesthetic Movement لە کۆتایی سەدەی نۆزدە، واتە بڕوای بە هونەر بۆ هونەر هەبوو و بە پێویستی نەئەزانی هونەر ئامانجێکی کۆمەڵایەتی یان ڕەوشتی هەبێ.

**دێلفی:** Delphic Oracle، دێلفی شارێک بووە لە یۆنانی کۆن لە لێژایی پارناسۆس و، ئۆراکلی دێلفی لە میسۆلۆژی یۆنانیدا پاکیزە ژنێکی پەیامهێنەرە لە لایەن ئاپۆلۆوە بۆ ئەوانەی داوای ئامۆژگارییان کردووە و، پەیامەکەش بە زۆری ناڕوون و فرەواتایە.

**دێوەرە:** چەرچی.

**دێوەزمە:** مێردەزمە، غوولی بیابان.

**دێزەڵە:** قوولایی بان سمت.

**دێوانە:** شێت، شەیدا و سەرگەردان، دەروێشێک کە عاشق و سەوداسەری پیری ڕێبازەکەی بێ؛ دێوئاسا.

**دیلۆس:** Delos، یەکێکە لە گرنگترین دوورگە ئەفسانەیی و مێژوویی و ئارکیۆلۆژییەکانی یۆنان کە بە زادگەی ئاپۆلۆن و ئارتمیس ناسراوە.

**دیلۆک:** دیلانێ، هەڵپەڕکێ.

**دیم:** ڕوخسار، ڕواڵەت، ڕوومەت :: دیمانەت بەخێر: شادم بە بینینی ڕوخسارت :: دیمەن: ئەو ڕووگە و ڕووبەرەی لە بەرەگەی ڕوانیندایە.

**دیواندر:** زۆر قسەزان.

**دیواندەر:** کون بوو لە هەر دوو دیوەوە.

**دیۆمەد:** Diomedes، لە ئەفسانەی یۆنانیدا ناوی شایەکە کە ئەو بێگانانەی ئەچوونە وڵاتەکەی، ئەیخستنە بەر ئەسپە مرۆڤخۆرەکانی، بەڵام سەرەنجام هێراکلێس ئەوی کرد بە خۆراکی ئەسپەکانی خۆی.

**دیوەرژەن:** تەپوتۆزی زۆر و زەبەند.




**ڕابەری سویسری:** بەو کەسانە ئەوترا کە بەڕێوەبردنی کلیسا لە ئەستۆی ئەوان بوو، واتە هەم ڕابەرانی ئاسایش و هەم زێرەڤانی کلیسا لە نێوان سویسییەکان هەڵئەبژێردرا.

**ڕابوونەوە:** جەژنی زیندووبوونەوەی عیسا ع عيد الفصح ف عید پاک E Easter.

**ڕاتلەکاندن:** ڕاوەشاندن بە توندی.

**ڕادان:** خاوێن کردنەوە :: گەوڕ ڕادان.

**ڕاڕا:** دڕدۆنگ، وازوازی، هەردەبیر، دوودڵ، بیرەبیر ف وسواس.

**ڕاسپاردە:** دوا گوتە و بڕیاری کەسێک پیش مردن، ڕاسپێری ف وصیت.

**ڕاشل ئەوسا کە خوا:** لە ئۆپێرای یەکدەنگی

هەرە بەناوبانگی La Juive «جوولەکە» دانانی فرۆمێنال ئالێڤی Fromental Halévy (١٧٩٩-١٨٦٢) ئاوازدانەری فەڕانسەیی.

**ڕاڤە:** ڕاژ ف ع وصف، توصیف.

**ڕانان:** ڕاوکردن و دەسبەسەراگرتن، پەیڕەوکردن، ڕاوەدوونان.

**ڕاواندن:** ورینەکردن، لەبەر خۆوە قسەی هەڵیت و پەڵیت کردن.

**ڕاوشکار:** شۆپ هەڵگرتن، یافت گرتن ف ع تعقیب، مطاردە، قنص.

**ڕاهشتن:** شبیخون.

**ڕاهی:** ڕزگاربوون، ڕەهابوون.

**ڕایشتاگ:** Reichstag پەرلمانی ئاڵمان لە ١٨٧١ تا ١٩١٨.

**ڕفحە:** ڕەفە، تاقەی زۆپ.

**ڕند:** جوان، شۆخ و شەنگ، خانومان.

**ڕۆبنشتەین:** Anton Grigorevich Rubinstein (١٨٢٩ - ١٨٩٤) پیانۆژەن و ئاوازدانەری رووسی، دامەزرێنەری کونسێرڤاتۆری سەنت پترزبۆرگ.

**ڕۆژنە:** ڕۆژن، ڕۆچنە، کولاوکە، دەلاقە :: کلاورۆژنە.

**ڕۆژەڤ:** واقیع.

**ڕۆژی بەری:** ڕۆژی بێ سەرەتا، ڕۆژی ئەزەڵ.

**ڕۆکۆکۆ:** Rococo، شێوازێکی هونەری ڕازاندنەوەی سەدەی هەژدە، لەگەڵ پەرەسەندنی بورژوازی لە فەڕانسە سەری هەڵدا، هونەرێکی گەشە و پڕە لە ژیان و خۆزگە.

**ڕواڵەتناسی:** physiognomy.

**ڕوخسان:** crystallisation، ڕوخسان یان ڕوخسکردن یان گەڕانەوە، پرۆسەی گەڕانەوە یان (کریستاڵیزە بوون و بە بلوربوون)ی شەکرە لە شیلەوە بۆ دانار یان کریستاڵ یان بلوور :: ڕوخسی کردووە: کریساڵیزە بووە، گەڕاوەتەوە (ئەگەر مرەبا بێ خراپ بووە).

**ڕووبینی:** مەرایی، خۆشامایی کردن، ماستاوکردن.

**ڕووژە:** ئەڵماس.

**ڕووش:** پرخاشگر.

**ڕەبەت:** حەشارگە، کەوشەنی خۆ حەشاردان.

**ڕەبەن:** بەلەنگاز، ڕەواڵ، ژار، کاسۆ، بێ تووتە، بێ دەر، لامیسک، بێ ئەنوا، ڕووت، زوار، هەناسەسارد.

**ڕەپ و ڕاست:** بێ ڕووبینی، ڕاستەوخۆ.

**ڕەختە:** خۆگر، تۆکمە؛ پۆشتەوپەرداخ.

**ڕەخنە:** هەڵسەنگاندن، بەراوردکردن؛ تەئسیر، کارتێکردن ف نفووز.

**ڕەزڵە:** مۆغەرەی پشت.

**ڕەسید:** متمانە، کرێدیت.

**ڕەشمە:** گوریسی باریک، هەوسارێک لە سەرکەللە ئەخرێ.

**ڕەشمێو:** زووڕەس E currant–bush.

**ڕەشۆکی:** بازاڕی، نزم ف مبتذل.

**ڕەشەکە:** خۆهەڵکێشی هیچ کارە ف لاف زن.

**ڕەقەبوار:** بواری دژوار :: بوار: دەراوی پەڕینەوە؛ ئەو بوارەی پەڕینەوەی لێئەکرێ بەڵام بە دژواری، ڕەقەبوار بەو شوێنانە ئەوترێ پرس و جۆی لێیە و باج وەرگرتن هەیە، ئەو باجەی کاروانچی کورد لە توانایدا نییە بیدات، بۆ وێنە پرسگەی باج وەرگرتن کاتی هاتن بۆ ناو شار؛ دەروازەی ڕێگەی بانە بۆ ناو شاری سەقز ناوی ڕەقەبوارە.

**ڕەگێژە:** وردە ڕەگ، وردە دەمار.

**ڕەمەن:** سرک، سڵ، ڕەڤۆک.

**ڕەند:** مێرخاس، خانەدان، بەهیممەت، بوێر، جەربەزە.

**ڕەندۆڵ:** ئاودڕی گوشاد؛ دۆڵچەی ئاوکێشان.

**ڕەوا:** حەڵاڵ :: ناڕەوا: حەرام.

**ڕەواز:** ڕێبازی دورودرێژ.

**ڕەوزە:** گێرانەوەی سەربردەی ئایینی و بەتایبەتی بنەماڵەی عەلی کوڕی ئەبوو تالیب و تراجیدیای کەربەلا و کوژرانی حسێن و یارانی بە شیعر و پەخشان وەکوو سەردۆلکە، بەتایبەتی لەناو شێعەی ئێراندا، لە مانگی محەڕەم و ڕۆژانی تاسووعا و عاشووورادا، کەچی لە هەمان ڕۆژانی نۆ و دەی محەڕەم لە وڵاتی وەکوو مەغریب ئاگری شادمانی ئەکرێتەوە و منداڵان جەژنانە وەرئەگرن، ئەمە لە کاتێکا کە بە گوێرەی شەجەرەنامەی بنەماڵەی پاشایەتی عەلەوی مەغریب، شای مەغریب محەمەدی شەشەم بە ٣٨ پشت ئەگاتەوە بە حەزرەتی عەلی.

**ڕەوزەخوێن:** ئەو کەسانەی ڕەوزە ئەڵێن.

**ڕەوەند:** ڕەوەن، هەوارگە بە مرۆڤ و ئاژەڵ و پاتاڵ و وڵساتەوە؛ خێڵی گەرمێن و کوێستانکەر، خێڵەکی.

**ڕەهات:** ڕووداو، کارەسات.

**ڕەهۆڵ:** تونێل، کونکردنی کێو بۆ دروستکردنی ڕێگە و نزیککردنەوەی ماوەی هاتوچۆ، کونکردنی بن عەرز بۆ کارێز و ئاوەڕۆی ماڵان ف دهلیز ع الرواق.

**ڕۆوینە:** وێرغە.

**ڕێزانە:** پاداشت، بەخشش لە بەرامبەر کاری چاکەدا.

**ڕێزخۆ:** عزت نفس.

**ڕێژەن:** فراوانی، بەرەکەت.

**ڕێکار:** شێوازی کار ف شگرد E trick.

**ڕێلاس:** نەسەلار، بێ ئەدەب.

**رێنە :** Renéی شاتۆبریان (١٧٦٨–١٨٤٨) لە لای هەندێ ڕەخنەگر بە باشترین نموونەی عەشقی ڕۆمانتیک ناسراوە، لە کاتێکدا شازادە دوکلیقی Princesse de Clèves دولافایت (١٦٣٤–١٦٩٣) بە بەرداشتێکی کلاسیک و ئاریستۆکراتی عەشق دانراوە.

ڕێوار: ڕاستگۆ.

**ڕیشوو:** گوڵینگ، بادراوی هەڵوەشاوەی کەناری قوماش.

**ڕیگی:** Righi کوێستانێکە لە سویسرا بۆ سەیرکردنی بەرجەوەنەکانی سەرئەکەون بۆ لوتکەکەی.

**ڕینگاڵ:** ئاوی میوە، شەربەت.



**زاخۆن:** کوول، کەوێل، زاخە، ئەشکەوتی قووڵ.

**زاغ:** مەیدانی درووێنە.

**زاڵگە:** پاسگە، بنکە.

**زایەڵە:** دەنگدانەوە، دەنگی شیوەن و گریان.

**زریزە:** زنجیری زۆر باریک.

**زکۆ:** زبر و دڕ و قەبە.

**زلحۆرت:** زلحۆ، زلی حەپۆل.

**زمانگێڕ:** کوڵەفیتنە، دووزمان.

**زمهەریر:** سەرمای زۆر سەخت کە ئەکەوێتە چلە چکۆلەوە.

**زۆرخاخ:** دۆڵی ئاش.

**زۆرگ:** زورگ، زورب، زەوی هەڵەت و چاڵ و بەرز، زنجیرە تەپۆلکە 🄵 ماهور.

**زۆزان:** ئێلاخ، هاوینەهەوار.

**زوا:** وشک، قاق.

**زورم:** تریشقە، تەندەر.

**زوجەناح:** واتە خاوەنی دوو باڵ، لە فەرهەنگی ڕەوزەخوێنیدا ناوی ئەسپەکەی ئیمام حسێنە کە بە سواری ئەو ئەسپە چووە بۆ شەڕی کەربەلا. زوجەناح ڕێزێکی تایبەتی لەلای شیعە هەیە و بە نازناوی «بُراق» ئەسپی تێژپەڕ ناوبانگی هەیە.

**زوجەوشەن:** شمری کوڕی زوجەوشەن، لە هۆزی «بەنی کلاب» سەرەتا لە یارانی عەلی ئەبی تالب بووە و پاشان چووەتە ڕیزی خەوارج. زۆربەی پەیڕەوانی ئاینزای شیعە، شمر بە بکوژی ڕاستەوخۆی ئیمام حسێن ئەزانن.

**زوور بوونەوە:** مۆڕبوونەوە.

**زوورە:** بەردەزوور، هەسانی زبر.

**زەخمە:** ئەو بزمارەی تاری پێ لێئەدەن 🄵 مضراب.

**زەرک:** قاپی ئاوخواردنەوە.

**زەرکەف:** دەزووی زەردی زێڕین، پۆدری زەردی وردە، ورکە زێڕ.

**زەل:** قامیش.

**زەلان:** قامیشەڵان.

**زەلاڵ:** ڕەوانی بۆ دەنگ و ئاواز؛ ڕوونی و سافی بۆ ئاو.

**زەمزەمە:** گۆرانی خوێندن لەبەر خۆوە. دەنگی بلاوێن.

**زەندک:** کۆش، دامین :: زەندکی کراس.

**زەنگن:** پاچ، قوڵینگ.

**زەنگۆ:** ئاوزەنگی، رکێف.

**زەهاو:** درزی باریک کە ئاوی لێ دێ.

**زێربەفت:** بە زێڕ چنراو.

**زێڵ:** دڵ، ناوەڕاستی هەر شتێ، ناوەزێڵ.

**زێوار:** زیوار، پەراوێزکاری، حاشیەبەندی :: زێوار زیو: بە زیو نەخشێنراو.

**زیانەخرۆ:** زیاتر مەبەستی کەسێکە لە سەر ورگی خەڵکی ئەژی E detrimental.

**زیارەتان:** سەرقەبران، گۆڕستان.

**زیفوورا:** Zipporah یان Zéphora یان سەفوورا ژنی مووسا بووە کە لە یەکێک لە دیوارنیگارەکانی نوێژگەی سیستیندا وێنەی کێشراوە.

**زیل:** دەنگی تیژی باریک.

**زیندەخەون:** خەیاڵی نێوان خەو و بێداری.

**زیرە:** کەموون.

**زیگ:** ژیگ، پەرتووک یان زانستی ڕێسای ڕێکخستنی ئەستێرە و لێکۆڵینەوە لە گەڕ و ناوەندی هەسارە و ئەستێرە و داڕشتنی ڕۆژژمێر؛ سەرەتا ژێ بووە و ژێ واتە دەزوو و، ژێ کە تان و پۆی کووتاڵی پێکهێناوە وەکوو خشتەی نەخشە لە کارگەی چنیندا بەکارهێنراوە. ژیگ یان زیگ لەوێوە بە واتای خشتەکانی ڕێسای ئەستێرەناسی وتراوە. سەبارەت بە ژیگ یان زیگ لەو زمانەی فارس پێی ئەڵێن پەهلەوی یان فارسی ناوەڕاست، **هیچ** ئەماژەیەک بۆ زیگ نەهاتووە و ئەم گۆڕانکارییانە هەمووی لە سەردەمی کوردی ساسانیدا ڕووی داوە. زیگی گەورە یان ژیگی شالیار، لەسەردەمی نەوشیروانی ساسانی، ساڵی ٥٥٥ی زایینی بەرهەم هێنراوە. عەرەب ژیگی کردووە بە زیج. ژیگ چووەتە ناو زمانی یۆنانی و لاتینی سەدەکانی ناونجی و بووە بە زیک یان ئەزیک ف ع الاسطرلاب، ابراج.

**زینە:** درکەزی، زی، دڕکێکە ئەیکەن بە پەرژین ف خاربن.

**زیوەر:** زیخ و بەردی درەوشاوەی بن ئاو و زەناو.



**ژاکۆبین:** jacobin یانەیەکی دیموکراتی، ساڵی ١٧٨٩ لە پاریس دامەزرا، کە

له رادیکاڵترین و بێبەزەییترین دەستە سیاسیەکانی ناو شۆڕشی فەڕانسە بوو. لەگەڵ ڕووبسپییێر بوونە مایەی ترۆری ساڵانی ١٧٩٣–٩٤ی فەڕانسە. ژاکۆبین ئێستە بە کۆمارێکی چەقبەستوو لە لایەن کابینەیەکی نەتەوەیی ئەوترێ.

**ژاڵە:** لووریل E laurel.

**ژنەڤیڤ دو برابان:** ژنەڤیف و گۆلۆ لە کەسایەتییەکانی ئەفسانەیەکی سەدەی ناونجین. ژنەڤیف چەندین ساڵە شووی کردووە و هێشتا منالی نەبووە. بەلاّم هەمان ئەو ڕۆژەی کە مێردەکەی ئەڕوا بۆ جەنگ، سکی لێی پڕ ئەبێ. گۆلۆی باش گزیر، پاش هەوڵدانێکی زۆری سەرنەکەوتوو بۆ تەفرەدانی ژنە، قاو دائەخا کە ژنە بەدکارەیە. ژنەڤیف هەڵدێ بۆ لێڕەوار و ماوەیەکی دوورودرێژ لەگەڵ مناڵەکەی لە ناو دارستان بە شیری ئاسکێک ئەژین. پاش ئەوەی شووەکەی ئەگەڕێتەوە لە کاتی ڕاودا ئەیدۆزێتەوە. بۆ سپاسکردنی ڕزگاربوونی ژن و مناڵەکەی کلیسایەک بۆ مریەمی پاکیزە دروست ئەکا. ئەم چیرۆکە بووە بە مژاری زۆر شیعر و شانۆگەری و ئۆپێرا.

**ژۆرژ بۆلانژە:** Georges Ernest Boulanger (١٨٣٧–١٨٩١) لە کۆتایی سەدەی نۆزدەدا (١٨٨٩) کە بۆلانژیسم لە پاش کزبوونی مارکسیزم بە هاوپەیمانی چەپی ڕادیکاڵ دانراوە.

**ژیار:** ژیانی شارستانی، شارستانیەت.

**ژێدەر:** ڕەگەز، بنەما، بنەچە، ڕەگەزی وشە ف منشاء، مصدر.



**ساپیتە:** لای هەرە بڵیند.

**ساماڵسا:** ساماڵ و لووسبوونی عەرد بە بەفر و داپۆشانی عەردی ڕەش.

**سامۆتراس:** Samothrace پەیکەری ماخوایەکی باڵداری بێ سەرە، ساڵی ١٨٦٣ لە دورگەی سامۆتراسی یۆنان دۆزرایەوە. ئێستە لە مووزەی لوڤری پاریسە.

**سان سباستیان:** Saint Sebastian ئەفسەرێکی ڕۆمی بوو کە بڕوای بە عیسا هێنا و لە ئەنجامی ئەم هەڵوێستەیدا گیرا و کوژرا، بۆیشە بووە بە یەکێک لە هێماکانی «شەهیدی ئەشکەنجە» لە فەرهەنگی مەسیحیدا و، لە تابلۆ و پەیکەرەکاندا بە جەستەی تیرئاژن کراوەوە وێنا کراوە.

**ساواز:** بێ شەرم، ڕووداماڵراو.

**ساوازە:** شەرم، حەیا، شۆ :: ساوازەی شکا: ڕووی کرایەوە، شەرمی شکا.

**ساورمە:** داری وشکی زۆپە، ئێزم.

**ساورین:** سابرین، نێری تەگە.

**ساویر:** هەڵوەسە، ساو، توهم، موهوم، وهم.

**سایمە:** نەخۆشی ئاژەڵ.

**سبادرە:** پێش کازیوە :: نە سبادرە نە بەرەبەیان.

**سپێدپەهنا:** کازیوە.

**ستاری سەردار:** ئەماژەیە بە ستارخان کە لە سەردارانی مەشرووتەخوازی تەورێز بوو و لە سەردەمی محەمەد عەلی شای قاجار، سەرەتای سەدەی بیستی زاینی خەباتێکی زۆری دژی دوژمنانی مەشرووتە کرد.

**ستارگرتن:** ئارامگرتن، هێوربوونەوە.

**ستێر:** پێرک، بەرزایی خۆڵ و بەردی کەوشەنی نێوان دوو زەوی.

**سرژ پانینی:** Serge Panine شانۆگەری جۆرج ئۆنێ Georges Ohnet لە ١٨٨١.

**سرمیچ:** سەرمیچ، بنمیچ [ع] سقف.

**سرووت:** لاسکی گەنم و جۆ، کلۆش.

**سرووش:** دەنگی پێوار، دەنگی لە غەیبەوە؛ لە ئاوێستادا بە واتای فریشتەی پەیامهێنەر و پەیکی ئەهوورامەزدا هاتووە.

**سکڵ:** پشکۆ، پۆلوو، پنگر.

**سکور:** ئەستۆ، مل، گەردن.

**سکورد:** ئەستۆ، مل، گەردن.

**سلۆک:** سرک، رەمیو.

**سناب:** snob و snobbery هەندێجار بە خۆپەرست و لە خۆبایی دانراون، بەڵام سنابری ئەبێ وەک بۆچوونێک چاوی لێبکرێ کە بڕوای بە هاوکێشەیەک لە نێوان مرۆڤ و باری ڕۆژەڤدا هەیە، ئەوەی لە خوارەوەی کۆمەڵدایە ئەبێ وابێ، سناب گرنگییەکی زۆر بە سامان و پلەی کۆمەڵایەتی ئەدا، کرنۆشبەری لە خۆی بالاترە و بە چاوی سووک ئەڕوانێتە خوارتر لەخۆی.

**سندۆڵ:** هاوەنی بەردی گەنم کوتان.

**سنگەبەر:** شوێنی سنگ لێداکوتراو بۆ بەستنەوەی پاتاڵ.

**سۆتە:** فاسق، گوناهبار، بێدین.

**سۆزانی:** کچە کاولی؛ بە واتای ئافرەتی خراپ و بێ شەرتوشۆ بەکار ئەهێنرێ.

**سۆلان:** رەسەن.

**سۆلاندنەوە:** تۆزاندنەوە، کزاندنەوە.

**سۆنگە:** بەهۆی، هۆکار.

**سوا:** وەستا، وەستاکار.

**سواڵەت:** گلێنە؛ گۆزە و دیزە و کیتەڵە و شتی دەوستکراو لە گلەسوورە کە سوورەوەکرابێ.

**سونگە:** دەرفەت، هەل، پەژدێر [ف] فرا غت .

**سووتک:** پاشماوەی شتی سووتاو :: سووتکە جگەرە.

**سوورەماسی:** Carp ف ماهی کپور ع الشبوط.

**سووتلّی:** قەپاتمە، ژنی بێ مارەیی راگرتن بۆ رابواردن.

**سوێبوونەوە:** سست بوونی دڵ بەهۆی ئازاری زۆرەوە، غەم خواردن بۆ کەسێک.

**سوێنە:** دۆڵەکە، تەشتی سواڵەت، تەشتی گلێنە.

**سەباح:** حەسەنی سەباح، کە بۆ دلّرەقی و تۆڵە سەندنەوە بە نموونە ئەیهێننەوە لە خێڵی «حمیر عرب» باوکی خەڵکی یەمەن بووە. دامەزرێنەری ئاینزای صباحیە یان ئیسماعلیە لەسەر بناغەی ئێمام بوونی نزاری کوڕی موستەنسەر لە سەدەی دوانزەی زاینی. سەباح ئەیوت خواناسی بە ئاوەز و زانین نییە بەڵکوو بە فێرکارییەکانی ئیمامە. سەباح مرۆڤێکی دلّرەق و بڕوای تەوای بە تیرۆر هەبوو و لە ماوەی ژیانی سەد ساڵەیدا هەزاران ترۆریستی پەروەردە کرد. نیزامەلمولک سەرداری ئەو هێزەی چووبوو بۆ گرتنی قەڵای ئەلەمووت، بنکەی سەباح، بە خەنجەری سەباحیەکان کوژرا، هەروەها دوو کوڕەکەی نیزامەلمولکیش یەک لە بەغدا و یەک لە نەیشاپوور تیرۆر کران. هەر کەس دوژمنایەتی ئیسماعیلیەی بکردایەت بە خەنجەری ترۆریستەکانی سەباح ئەکوژرا. تەنانەت سوڵتان سەنجەر، کە خەنجەریان لە عەرزی ڕەقی ژووری خەوەکەی چەقاندبوو و نووسیبوویان: **ئەو خەنجەرەی لە عەرزی ڕەق رۆبچێ، سینگیش کون ئەکا**، لێیان ترسا و لەگەڵیان ڕێککەوت. سەباح تەنانەت دوو کوڕی خۆیشی کوشت کە پێی وابوو بەدڵی ئەو پەیڕەوی لە دین ناکەن. بۆ ناسینی سەباح پێویستە «قەڵای ئەلەمووت ف قلعە الموت» بخوێنرێتەوە.

**سەبەلان:** کێوێکی بەرز و بە ناوبانگە لە پارێزگای ئەردەبیل، باکووری رۆژاوای بەناو ئێران.

**سەراسا:** لە ئەندازە بەدەر E سەیر، extraordinary.

**سەراسێ:** سەراسۆ، سەرێشە، پاڵەپەستۆ و گوشاری ژیان.

**سەربەردە:** جیوەلەک، یارەمەز، ماڵانگەڕ ف هرجایی.

**سەرتیپ:** لە بری پلەی سەرگورد هاتووە لە سپای ئێراندا. سەرتیپ لە هێزی پێشمەرگەی کوردستاندا پلەیەکە هاوتای سەرگوردە.

**سەرجەڵە:** پێشەنگ؛ سەرەتا.

**سەرچڵ:** بەهەڵە و لەز و بینەکەرەوە.

**سەردار سپا:** رەزا قەزاق، رەزا ماکسیم، کە بە دەستی ئێنگلیس کوودتای لە قاجارەکان کرد، بە ناوی رەزا شای پەهلەوی پاشایەتی پەهلەوی دامەزراند. لە **١٩٢٥** تا **١٩٤١**ی زایینی. رەزا قەزاق کە هەتیو بوو و بە هەژاریی گەورە ببوو، هیچ ناو و نیشانێکی نەبوو. راوێژکارەکانی بە باشیان زانی ناوێکی بۆ هەڵبژێرن شیاوی پادشا بێ. بۆ نموونە رەزا پالانی واتە کورتاندروویان کرد بە **رەزا پەهلەوی** گوایە کۆلکەی بگاتەوە بە ئەشکانیەکان. جارِ درا؛ کێ پەهلەوییە ئەبێ ناوی خۆی بگۆرێ، ئیتر کەس بۆی نییە پەهلەوی بێ! یەکێک لەو کەسانەی چیرۆکەکەی دەنگی دایەوە **مەحموودی پەهلەوی** نووسەری بەناوبانگ و خاوەنی پەرتووکی هەشت بەرگی **مێژووی پەیوەندی سیاسی ئێران و ئینگلیس** بوو. کاتێکە ناوەکەیان لێ سەندەوە، وتیان ناوێکی تر هەڵبژێرە. ئەویش وتی جا کە ناوی خۆم بە کەڵەگایی لێ بسێنن و نەتوانم هیچ بکەم، دیارە بەس مەحموودم و لەوە زیاترم شیاو نییە. لەوەولا مەحموودی پەهلەوی بوو بە **مەحموود مەحموود!** رەزا خان کە تەنها خۆی و کورِەکەی محەمەد رەزا پادشاییان کرد و، کورِەکەشی هەمان چارەنووسی خۆی هەبوو، واتە سەرەتا دایان نا و پاشان لە وڵات دەریان کرد، گەورەترین زەرەریان لە فەرهەنگی ناوچەکە دا و نەک هەر ناسنامەی خەڵکیان بە ئاشکرا دزی، مێژووشیان سەر لە نوێ نووسیەوە. وشەی ئێران کە تا ساڵی **١٩٣٥**ز بۆ ناوی ناوچەکە و نەتەوە ئێرانیەکان بە تایبەتی کورد و ماد بەکار هێنرابوو، نەک بۆ سیستەمێکی حکوومەتی، دزییان و حکوومەتەکەی خۆیان ناو نا ئێران. لە دەیان هەزار سکەی زێرِ و زیو و ئاسن کە دۆزراوەتەوە تەنها یەک دانەیان، لە هیچ سەردەمێکدا، وشەی **ئێران** ی لەسەر نەنووسراوە. ئەوسا کەوتنە نووسینی مێژووی **٢٥٠٠** ساڵە، ئەو زنجیرە حوکمدارییانەی تورک و تەتەر و غوز و ئوزبەک و مەنگول و گوورکانی و سلووکی و هەموو جۆرێکی تیایە، فارس نەبێ. ئەم پرِۆسەیە تەنها لە بواری ناسنامە و مێژووەدا نەبوو. رەزای هەتیو کە هیچی نەبووە و بە منالی، لەبەر نەداری، نەخۆش ئەکەوێ و لەسەر رێگە فرِێی ئەدەن و خێرەومەند هەڵێ ئەگرنەوە، لە ماوەی **١٦** ساڵ پاشایەتی خۆیدا، تا ئەو رۆژەی کە هەمان ئینگلیس کاری پێی نەما و نەک هەر شاربەدەر بەڵکوو وڵات بەدەری کرد، **حەوت هەزار** گوندی لە دەس خاوەنەکانی دەرهێنا و کردنی بە ناوی

خۆیەوە. ئەمە جگە لە سەدان کۆشک و کارگە و دامەزراو و... ☜ داریووش.

**سەردۆلکە:** سەروە، شینگێری و بە مردوودا هەڵگوتن.

**سەردە:** (ئاڤێستایی) جنس، جندر E genus ،gender.

**سەرسپێری:** پەیمانی فەرمانبەری، ئەمەگداری بندەستانە، راژێری ع ف بیعة.

**سەرکەش:** گوریخ، گورخ ف ماجراجو E Adventurer.

**سەرگەرد:** قوربانی، گۆری، فیداکردن.

**سەرگەشتە:** نارازی، بێمەیل، حەیران.

**سەرگێر:** کۆز، حەوشەمەڕ.

**سەرمەند:** سەرسووڕماو، واق وڕماو ف شگفت زدە.

**سەرۆ:** گۆوار، بەدڵداهاتن، دەم ف ع الهام.

**سەروە:** سەردۆلکە، لاواندنەوەی مردوو بە شیعر و ئاواز.

**سەرە:** خۆ بەشت زان، پێگەیشتوو :: سەرەژن، سەرەپیاو.

**سەکوت:** بیچم :: سەروسەکوت.

**سەلار:** بەئەدەب. (ڕێلاس: نەسەلار).

**سەڵتە:** سەرجلێک لەسەر کەوای ئاودامێنەوە لەبەر ئەکرێ.

**سەمک:** تۆپەڵە.

**سەمەد خان:** ناسراو بە مومتازوسەڵتەنە ۱۹۶۹-۱۹۵۵ لە سەرەک وەزیرانی پاش مەشرووتەی ئێرانە. لە پاش شەڕی چوار رۆژەی تەورێز لە ساڵی ۱۹۱۱ی زاینی کە مەشرووتە خوازەکان شاریان بەجێ هێشت، رووسەکان سەمەد خانیان کرد بە حاکمی تەورێز. ساڵی ۱۹۱۸ بوو بە سەرەک وەزیرانی حکوومەتی قاجار.

**سەمەرە:** کەڵلەی کورتان، قەڵپۆزی زین؛ رووداوی دڵتەزێن؛ دیاردەی سەیر و عەجیب.

**سەمەندەر:** گیانەوەرێکی ئەفسانەیی کە بە بڕوای پێشینان لە ئاگردا ئەژیا، خەجۆکە، ئاگرخۆر.

**سەمەنی:** گەنم و نیسکی رووای سەر دەوری یان بە دەوری بتڵەوە کە دوو حەفتە پیش نەورۆز ئەیچێنن و دوو حەفتە پاش نەورۆز واتە رۆژی سیانزەبەدەر بە هەڵدانی بۆ ناو چەم بەسەر سەریاندا وەیشوومەی پێ راوئەنێن.

**سەن بێرنارد:** Bernard of Clairvaux (۱۰۹۰-۱۱۵۳) دامەزرێنەری کلیسای دوکلرڤۆ بنکەی رێبازی بندیکتی ناسراو سیستریکان، هەڵایسێنەری خولی دووەمی جەنگی خاچپەرستان، هەرچەند گوایە پەیرەوانی هەموو کاتی خۆیان بە نوێژ و خوێندنەوەی ئینجیل و

کارەوە خەریکن.

**سەنج:** ئامێرێکی مووسیقایە.

**سەنت ماری دێل فیرۆ:** Santa Maria del Fiore کلیسای مەزنی شاری فلۆرانس، سەدەی چواردە و پانزە دروستکراوە، ئەم کلیسایە لە جوانترین نموونەکانی خولی گۆتیکی ئیتالیایە.

**سەنتین:** Xavier Boniface Saintine (١٧٩٨-١٨٦٥) شانۆ و ڕۆماننووسی فەڕانسەیی.

**سەن تیۆفیل** یان **چوار کوڕانی ئەیمون:** چیرۆکێکی گەلەری سەدەی ناونجییە سەبارەت بە ململانێی شارلمانی و چوار کوڕی دووک ئەیمون کە سووکایەتیان پێکردبوو. شارلمانی لێیان خۆش ئەبێ بە مەرجێک بایارد، ئەسپە جادووییەکی خۆیان بدەن بەو. یەکێک لە کوڕەکان بە ناوی ڕێنو، پاش ئاشتکردنەوە وەکوو داوای لێبوردن کلیسای کۆڵنی لە ئاڵمانیا دروستکرد.

**سەن زێنۆ:** ئەمازەیە بە نوێژگەی کلیسای سەن زێنۆ لە شاری ڤێرۆنای ئیتالیا، کاری ئاندریا مانتێنیایە. لای سەرەوەی ئەم بەرهەمە هێشتاش لە شوێنی خۆیەتی بەڵام ئەویتری ناپۆلیۆن بردی بۆ فەڕانسە و لە مۆزەخانەی لووڤر و توور دانراوە.

**سەن کلوو:** کۆمۆنێکە لە ڕۆژاوای پاریس و یەکێکە لە دەوڵەمەندترین گەڕەکەکانی فەڕانسە.

**سەنگەک:** جۆرە نانێکە لە ناو فرنی بە خڕەبەردی بچکۆلە فەرشکراودا ئەبرژێنرێ.

**سەوخان:** خافڵان، گوێ نەدان بە ئەرک.

**سەوڵ:** داری سەرو.

سەنت بێڤ: Charles Sainte-Beuve (١٨٠٤-١٨٦٩) ڕەخنەگری وێژەیی فەڕانسەیی.

**سەهۆڵی نێوانیان تواوەوە:** The ice once broken واتە ئیتر ببوون بە برادەر.

**سەیزان:** سەرداف ☞ سرداب.

**سەیزوو:** بەیانی.

**سەیزووشەو:** بەیانی شەو، سبەی شەو.

**سەیوان:** سایەبان، سابات.

**سیانزەبەدەر:** ڕۆژی سیانزەی پاش نەورۆز خەڵکی لە شار ئەچن بۆ سەیرانگەکانی دەرەوەی شارەکان، هەڵئەپەڕن و گۆرانی ئەچڕن و ئەخۆن و ئەخۆنەوە. یەکێک لە بەرنامە تایبەتەکانی سیانزەبەدەر ئەوەیە کە گەورە و بچووک سەمەنی پێش نەورۆز بەسەر سەری خۆیاندا حەوا ئەدەن بۆ ناو چەم و بەو جۆرە شوومی و وەیشوومە لە خۆیان دوور ئەکەنەوە و گەنجانی کچ و کوڕ جگە لەوەش بە فرێدانی سیانزە

بەردۆچکە بە سەر سەریاندا بۆ ناو ئاوەکە و هەرواها گرێدانی سەوزە خۆزگەی بەختەوەری و بە مرازگەیشتن بۆ خۆیان ئەخوازن.

**سێبەرەۆ:** نۆبەتێ، نەخۆشینی بێ خۆری و دووربوون لە تیشکی هەتا :: هەر کەس سێبەرم لێبگرێ، سێوەرۆ بگرێ.

**سێپەک:** سێپایەی مەشکە.

**سێت بلۆق:** ژنی ئیشتیا لە گان، حەشەری.

**سێڤینە:** Marie de Rabutin–Chantal, marquise de Sévigné (١٦٢٦–١٦٩٦) ئاریستۆکراتی فەرانسەیی، بە هۆی نامەکانییەوە ناسراوە کە گەش و زیندوو و فراوێژ بوون و بە یەکێک لە ئایکۆنەکانی وێژەی فەرانسە دائەنرێ.

**سێلتیک:** Celtic، گرووپێکی هیندو ئورووپییە بە ئیرلەند و ویڵز و سکاتلەند و برتۆن و هی تریشەوە، لە بواری ئاین‌دا بە بۆچوونێک ئەوترێ کە ئەیەوێ بنەماڵەی سێلتیک زمان لە بن کلیسایەکی سەربەخۆ لە کلیسای کاتۆلیک یەک بخات.

**سیاگوان:** نەخۆشیەکی ئاژەڵە کە گوانی ئەپەنەمێ.

**سیاوەش:** یان سیاوەخش کوڕی ئازا و پاڵەوانی کەیکاووس، لە کەسایەتیە بێ بەختەکانی شانامەی فیردەوسیە.

**سیپ:** گای شەش ساڵە؛ سندووقی تەختە سێ‌لا :: سیپی چای.

**سیر:** کێشێکە بەرامبە بە حەفتا و پێنج گرم.

**سیرمە:** ریشاڵی چەرم.

**سیستان:** ناوی ناوچەیەکی مێژووییە ئەکەوێتە سێ سنووری ئێران و ئەفغانستان و پاکستان. سیستان و بلوچستان ناوی پارێزگایەکە لە باشووری رۆژهەڵاتی بەناو ئێرانی ئێستە.

**سیسەمبەر:** گیایەکی بۆن خۆشی گەڵا پانی ددانەدارە لە خێزانی نەعنا.



**شاروخ میرزا:** کوڕی رەزاقولی میرزا، جێگری نادر شا، چوارەمین پادشای ئەفشاریەکان، سەدەی ١٨ی زاینی.

**شازدە:** بە وەچەی شا ئەوترێ لەو کەنیزانەی لە دەربار کار ئەکەن و، بە تەوسەوە پێیان ئەوترێ شازدە واتە شازادەی نارەسەن؛ لووسکە، لووس و پووس.

**شا سمایل:** دامەزرێنەری پاشایەتی تورکی شێعەی سەفەوی، سەدەی شانزەی میلادی، زیاتر لە ٢٢٠ ساڵ دەسەڵاتیان بە دەس بوو.

**شانیەشەکێ:** شانەوشان، دیلانێ.

**شکارتە:** بەشێکی چکۆلە، بەشی مەرەزەی گۆخلێ.

**شلۆ:** لێلێ، شلوێ 🄵 مکدر.

**شلوێ:** شلۆ، لێلێ 🄵 مکدر.

**شمشاد:** داری شمشالێ.

**شۆ:** حەیا، ئابڕوو: شەرم و شۆ.

**شۆپ:** شوێنەوار و شوێن پا، یافت.

**شۆپاژۆ:** رانەر، راوەدوونەر، ئەو کەس یان دەستەیەی ئەکەوێتە شوێن کەس یان کەسانێک. 🄵 تعقیب کننده.

**شۆڕەبی:** شەنگەبی، جۆرێکە لە بی کە لکەکانی شۆڕ ئەبنەوە.

**شۆش:** هەست، شعور.

**شۆک:** شۆکە، گەزۆی مازوو، دۆکە، بەلایەکە گەلای مێو سپی هەلئەگێرێ.

**شۆلە:** گڕئەستێرە 🄵 شهاب.

**شوورە:** دیوار و بارووی بەرز.

**شووش بەستن:** هەلمسان، ئاوسان، پەنەمین، هەلسان.

**شەبستەر:** شارێکی زۆر کۆنە و مانناکان لەوێ حکومیان بەدەست بووە و ئەمڕۆ بە یەکێک لە شارەکانی ئازەربایجانی رۆژهەلات دائەنرێ، نزیکی تەورێزە. چیرۆکی **حسێن کوردی شەبستەری** لە پالەوانانی شوانکارەی سەردەمی شاعەباس بەناوبانگە.

**شەربەلیەهوود:** شەراب خواردنەوەی جوولەکە و مەبەست شەراب خواردنەوەیە بە نهێنی، چونکە وەک لە غیاسوللوغاتدا هاتووە، جوولەکە لە ترسی موسلمانان بە نهێنی شەرابیان ئەخواردەوە.

**شەفتوولی:** لار 🄵 مایل.

**شەقەبی:** راستەبی.

**شەقیلە بەستن:** لە چلکا رەق بوون وەک بەرەلبێنە و تەقیلە کە چلک و عارەق رەقی ئەکا.

**شەلکە:** نەخۆشیەکی سمی ئاژەلە.

**شەلیاو:** شەلیای، مالدزراو، رووتەوە کراو.

**شەمایل:** پەردەنیگار.

**شەمامەبەندی:** گولکاریکردن و گولدۆزی کردنی سەرپەنجەی کلاش و گیوە بە بەنی رەنگاورەنگ وەکوو شەمامە.

**شەمزاندن:** تۆراندن، دلێشاندن.

**شەمشەلە:** شەمشەمەکوێرە.

**شەمووز:** تۆسن، تووش، لەچەر.

**شەنیل:** لە رووسی، پالتاوێکی بێ قۆلی سینە ئاوالەیە ئەدرێ بە شاندا و لە دەوری مل گرێ ئەدرێ.

**شەوپەرە:** شەمشەلە، شەمشەمەکوێرە.

**لێبووک:** شانۆگەریەکە کە هونەرپیشەی شانۆکە روومەتی خۆی بە خەلووز رەش ئەکات و قژی بە لۆکە سپی ئەکا، جلی

کونە لەبەریدا ئەکەوێتە حەنەک و شانۆگەری؛ لە هەندێ شوێن هونەرپیشە کیسەیەک ئارد لە بن کراسەکەیدا ئەشارێتەوە و کاتی سەما و یاری ئارد ئەکا بەسەر بینەراندا تاکوو زیاتر ببێتە هۆی شادی و پێکەنین ☞ شبازی.

**شەودیز:** ناوی ئەسپەکەی خەسرەوی نەوشیروان بووە کە نەخشی خۆی بە سواری هەمان ئەسپەوە لە تاق وەسانی کرماشان لەسەر بەرد هەڵکەنراوە. تاق وەسان بە تاقی شەودێزیش ناوبراوە، شەودیز کە بە واتای ئەسپی رەش و لە رەنگی شەو هاتووە، لەبری وشەی تورکی قەرەئات واتە ئەسپەکەی مارال دانراوە کە کورتکراوەکەی **شەوەیە**.

**شەوژەن:** کێلوونی دەرگا داخسن بە شەو.

**شەوسین:** رەتڵدان، لەتردان، سەرسم دان، پێ هەڵەنگووتن.

**شەونخوونی:** شەوبێداری و نەخەوتن، جا بۆ شادی یان پەژارە.

**شەوە:** یاقووتی رەش، کارەبای رەش؛ شەودێزی ئەسپەکەی مارال.

**شێ:** زەردی مەیلەو سوور؛ سپی پەڵە سوور، رەش بە سێ هێڵی سپیەوە :: ئەسپە شێ.

**شێخ خەزعەل:** ناسراو بە سەردار ئەقدەس فەرمانڕەوای خووزستان بوو. پاش ئەوەی براکە خۆی ئەکوژێ موزەفەروسەڵتەنە لەبری ئەو ئەیکا بە حوکمڕانی موحەمەرە یان خوڕڕەمشاری ئێستە و پلەی ئەمیر توومانی ئەداتێ. تووما‌ن وشەیەکی مەغوولیە، واتە دە هەزار. ساڵی ١٩٣٦ زاینی لە بن چاودێری پۆلیسی رەزاخان دا ئەمرێ.

**شێخ نەعمەتوڵڵای وەلی:** ☜ نەعمەتوڵڵای وەلی.

**شێف:** وەرد؛ کێڵانەوە، کێڵان بۆ جاری دووەم.

**شێما:** نموود، نما.

**شێوە:** فێڵ، تاکتیک، تەردەستی.

**شێ وەرد:** کێڵان، کێڵانەوەی زەوی بەراو.

**شێوەلێدان:** فێڵ‌لێکردن، پاشقول لێگرتن، تاکتیک بەکارهێنان، تەردەستی نواندن.

**شێوی غەریبان:** شەوی خەڵکانی غەریب و لە کەسوکار دوور. لە شیعردا زۆر ئەماژەی پێکراوە:

**ژینم لەناو پرچی لاولاوت ئەزانی چۆنە**
**وەک شـەوی غەریبانی رووت و ئاتاجە**

**شیپ:** پەت، قەیتان؛ گشتەک یان پارچە پەڕۆی بە دارێکەوە بەستراوە و منالآن شەللاقی پێ ئەخولێننەوە.

**شیپ وەشێن:** ئەو کەسەی کاتی ڕێکردن بە شڵپ و هۆڕ ئەڕوا بەرێدا و بەتایبەت ژن کە دامێنی کراسەکەی وەکوو شیپی

شەلاق خولاندنەوە رائەوەشێنێ؛ بە ژنی سووک و چرووک ئەوترێ.

**شیتاڵ کردن:** ونجڕ ونجڕ کردن. دڕاندن.

**شیرا:** مەڕ و بزنی شیردەری ناڵەبەر.

**شیرە:** شیرەی تریاک. سوختەی تریاک، پاشماوەی تریاک کە جارێکیتر بەکاری ئەهێنن و ئەیکێشن.

**شیلەوگەرم:** شلەتێن، ساردوگەرم.

**شیوکردن:** جل شۆردن.



**عەریف:** سەرگرووبان ☐ استوار.

**عەزرەت:** ئامەزرۆیی، حەز، هەڵچوون.

**عەگال:** پاشوەن، چۆکبەند.

**عەلی ئەکبەر:** کوڕی ئیمام حسێن، ئیمامی سێیەمی شیعەکان و لەیلا ئەبی مەرەیە، لە مەدینە لەدایک بوو و لە کەربەلا کوژرا.

**عەوداڵ:** عەبداڵ، ئەبداڵ، دەروێشی گەڕیدە کە دەستی لە دنیا و ماڵی دنیا داشۆردووە و بە دوای ونبووی دا ئەگەڕێ؛ بە ژمارەیەک لە پیاوچاکان (بە پێی ئەم بۆچوونە ژنیان تیا نییە) ئەوترێ کە جیهان بەوانەوە راوەستاوە و ئەوسا کە یەکیان ئەمرێ خوا یەکیتر لە جێگەی دیاری ئەکات بۆ ئەوەی ژمارەیان کە گوایە حەوت یان حەفتا کەسە وەک خۆی بمێنێتەوە. ئەم دەستەیە لە هەموو رازەکانی سروشت و عەرز و ئاسمان شارەزان. نیشانەیان ئەوەیە کە مناڵ یان مناڵی نێرینەیان لێ نابێتەوە. یەک لەمانە حەفتا ژنی هێنا و مناڵی لە هیچکامیان نەبوو. ئەوانەی ژمارەیان بە حەفتا ئەزانن ئەڵێن چلیان لە شام و سیەکەی تریان بە هەموو لایەکدا بڵاون. ئەوانەش کە ئەڵێن حەوتن بڕوایان وایە هەرکام لەمانە دەسەڵاتی یەک هەرێم لە حەوت هەرێمی جیهانی بەدەستە و هەرکامەیان جێگرەوەی پێغەمبەرێکن. یەکەمیان جێگرەوەی ئیبراهیمی خەلیل و پارێزەری هەریمی یەکەمە، دووەمی جێگرەوەی مووسا، سێیەمی هاڕوون و چوارەمی ئیدریس و پێنجەمی یووسف و شەشەمیان جێگرەوەی عیسا و حەوتەمین جێگرەوەی ئادەم و پارێزەری هەرێمی حەوتەمە.

**عەیار:** عەیار بە بۆچوونی هەندێ هەمان **ئەی یار** ە. عەیاران خاوەنی رەوشت و بنەمای تایبەت بوون لە ژیان و خەباتدا. یارمەتیدانی هەژاران و بەخشندەیی و جوامێریان کردبوو بە ئامانجی خۆیان. ریشەی جوامێری لە لایەن عەیاران سێ بنەما بوو: ئەوەی

که ئەیلێی ئەنجامی بدە، جگە لە راستی مەلێ و سەبر و ئارامی بکە بە پیشەت. بەڵام ئەو خاڵانەی کە عەیاران لە ماوەی ژیانی خۆیاندا پێبەندی بوون، بریتی بوو لە رازداریی، راستگۆیی، یارمەتیدانی داماوان، داوێن پاکی، خۆ بەختکردن، دۆستی دۆست بوون و دوژمنی دوژمن، بێباکی، پەیمانداریی، سوێند راگرتن، دووزمانی نەکردن و دەسبڵاویی. یاقووبی مسگەر لەم دەستەیە بوو و بە یارمەتی عەیاران حوکمڕانی سەفاریانی لە خوراسان دامەزراند. عەیاری پاشان لەگەڵ سۆفیگەری تێکەڵاو بووە و بووە بە فوتووەت (ع فتوت). حافز و مەولانا و عەتاری نەیشاپووری پەسنی ئەدگاری عەیارانیان کردووە؛

حافز:

**چ باک ئەو زوڵفە چین چینە ستەمکار**

**و بەڵا هێنە ــ لە بەند و کۆت نەترساوە**

**ئەوەی عەیارە لەم شارە**

مەولانا:

**بە گیانی هەموو مەستان کە مەستم**

**بگرە ئەی دڵبەری عەیار دەستم**

عەتار:

**سەر لە ڕێ دانان وەکوو عەیاران**

**گیان لەبەری دەست لە دەرگای یاران**

**عەیارداوەر:** دادگەری جوامێر.

**عەیارداوەریی:** دادگەریی جوامێرانە.

**عیرفان:** رێبازی گەیشتن بە خوایە لە رێگەی هەستکردنی قوڵی خوا لە ناخی خۆدا و سەردانەواندنی بە دڵ و گیان بۆ ئەو عەشقە. عیرفان ناسینێکە لە رێگەی دۆزینەوە و هەستەوە نەک بەڵگاندن و پشکنین، بۆیەشە بە زانستی ویژدانی ناوبراوە. پەیڕەوانی عیرفان، بە عارف ناوئەبرێن.



**غووژ:** داماو، دژ، کزۆڵە.

**غەزریو:** زۆر تووڕە :: ئەڵێی بەرازی غەزریوە.

**غورد:** پاتاڵی خۆش هەڵبەز و دابەز.



**فاق:** درز، قەڵەش.

**فایتوون:** عەرەبانەی دوو ئەسپە.

**فراز:** وشک و رووتەن.

**فرلێدان:** فەن لێدان، لە زۆرانبازیدا.

**فرانش کونتە:** Franche_Comté پارێزگایەک لە سنووری فەرانسە و سویسرا، سەردەمی لویی چواردەهەم لە ساڵی ١٦٧٨،

کەوتە ژێر دەسەڵاتی فەڕانسەوە.

**فراوێژ:** فرباز، دەم بە گاڵتە.

**فرباز:** زماندرێژ، پلارهاوێژ.

**فرسەق:** یەکەی پێوان بەرامبەر بە شەش کیلۆمەتر.

**فرۆزە:** ئەدگار، تەیبەتمەندی ف صفت، خاصیت.

**فرەوەر:** فەرەوەر، بەشکۆ، مەتین و بە هەیبەت، جیاواز.

**فریز:** frieze کەندای سەر بەرد یان دار :: فریسکۆ: کێشراوی سەر دیوار.

**فرین:** پەرین، لێدان :: پەڕەکانی لووتی ئەفری: پەڕەکانی لووتی لێیان ئەدا، ئەلەرزین، ئەلەرینەوە :: چاوفرین: لەرینەوەی پێلوەکان؛ لە بڕوای کوردەواریدا باوە ئەڵێن چاوفرین شتێکی بەدواوەیە :: چاوم ئەفری پارەچە نانێکم خستە سەری، نان پیرۆزە و هیوای وایە چاوفرینەکەی ئەنجامی خراپی بە دواوە نەبێ.

**فوارە:** کوڵکوڵە، کوفارە.

**فەراگەرد:** دەوروبەر.

**فەرتاش:** بوون، وجود، هستی.

**فەرجام:** فەرگاف، ئاکام، ئەنجام، کۆتایی :: بێ فەرجام: بێئاکام، ناکام، چارە ڕەش، دوارۆژ رەش.

**فەرماندار:** لە سەردەمی پاشایەتی پەهلەوی بەرپرسی یەکەمی شار واتە فەرماندار لە لایەن شاوە دائەنرا، بەڵام سەرۆکی شارەوانی بە هەڵبژاردن بوو، فەرماندار دەسەڵاتی لە سەرۆکی شارەوانی پتر بوو.

**فەرەوەر:** بەشکۆ، مەند، مەتین و بە هەیبەت، جیاواز.

**فەوج:** کۆمەڵێکی زۆر لە مرۆ :: فەوجێ ژن هاتن؛ بەشێک لە سپا لە هەزار کەس کەمتر نەبێ، هێز.

**فێست:** fez، فینە، فێس، جۆرێ کڵاوی سووری کەللەقەندی سەرقرتاو لە لوبنان و میسر و... باو بوو.

**فیلار:** قۆندەرەی ناڵچە ئاسن.



**ڤینی:** Alfred de Vigny (١٧٩٧-١٨٦٣) هۆنەر و ڕۆماننوس و شانۆگەری فەڕانسەیی.



**قاپان:** خۆهەڵکێش، بەفیز و دەعیە، لووتبەرز.

**قازان:** شەلووف، مەنجەڵی زۆر گەورە.

**قاسە:** سندۆقی پۆلا، گاو سەندووق.

**قاف:** کێوی قاف: کێوێکی ئەفسانەیی بەرزە و گوایە دەوری زەوی گرتووە و خۆر لە پشتیەوە هەڵدێ و شەوانەش لە چاڵێک لە پشت ئەو کێوە لێی رائەکشێ. پێشینیان کێوی قافیان بە گوڵمێخی زەوی زانیوە و وتوویانە لە پیرۆزەیە و شینایی ئاسمان تاودانەوەی رووناکی پیرۆزەیە، ئەگینا ئاسمان بۆ خۆی لە عاج سپی ترە. بە سەرچاوەی ئاوی ژیانیش ناوبراوە و لە وێژەدا بە واتای دوورترین شوێنی جیهان هاتوە، هەمیش بە جێگەی قەقنەس زانراوە.

**قاقڕ:** زەوی رووتەن، کەویر.

**قاڵکردن:** دارێژان، لە قاڵب دان :: گورگی قاڵێکن: شەریکە بەشن، هاوکار و هاوپیاڵەن.

**قاڵنگە:** بەنی هەڵکراو بە شێوەیەکی تایبەتی راست و چەپ لە پەنجە گەورە و پەنجە تووتە دەئاڵێنرێ و پاشی ئەوەی ناوقەد بەرەوژووری ئەبەسترێ جەمسەرەکەی تری لەپەسا ئەکرێتە کار بەبێ ئەوەی بلاو ببێتەوە، لە کاتێکا گلۆڵە ئەگەر جەمسەرەکەی بگری و بەری بدەی، تل ئەبێتەوە و ئەڕوات.

**قالۆرە:** ناوبۆش، ناوبەتاڵ :: وەک قالۆرە: وەکوو زەلی ناوبەتاڵ.

**قام:** مەقامی مووسیقا.

**قامک:** پەنجە، ئەنگوست، تپل، کلک :: کلکەوانە: ئەنگوستیلە.

**قانگدان:** دەربەڕاندن بە دووکەڵ :: قانگدانی مێش هەنگوین.

**قدۆش:** شووم، پێ ڕەش، نەحس.

**قرساندن:** خەملاندن ف تخمین زدن.

**قسر:** نەزۆک.

**قسڵ:** ئاهەک.

**قشڵە:** پادگان، مەعەسکەر.

**قنچکان:** چیچکان، هەڵترووشکان.

**قنەلاشک:** پەلک و گەلای وشکەلاتووی کنگر بە دەم باوە.

**قۆچ:** بەران.

**قۆچاخ:** زیرەک، وشت، وریا، بزۆز، چالاک.

**قۆچەک:** کۆپارە، بەرزایی پشتی وشتر.

**قۆزاخە:** شکۆفەی گەیشتووی پەموو.

**قۆشمە:** قسەخۆش، نوکتەباز.

**قۆقز:** زەق، زۆپ، کووڕ ف محدب.

**قۆڵچی:** پۆلیس.

**قوباد:** قوبادی یەکەم کوڕی پیرۆز، پادشای ساسانی کە دوو جار چووە سەر تەخت؛ قوبادی دووەم یان شیرۆیە کوری خوسرەو پەرویز پادشای ساسانی؛ کەیقوباد یەکەم پادشای کیانیەکان بوو.

**قورم:** هیس، دووکەڵی نیشتوو، دووکەڵی چڕ.

**قورقوراچکە:** قورقوراگە.

**قوشقی:** سڵ، توورە، وەڕەز.

**قولاج:** بست، بنگووس.

**قوڵتەشی:** سووکایەتی پێکردن :: بە قوڵتەشی: بە سووکایەتی پێکردنەوە.

**قوڵەدز:** گەنەدەز.

**قوڵتە:** مەلێکی گەرمیانییە لە چۆلەکە ئەکا و هێلانەیەکی قورینە لەناو مەزرا بۆ خۆی دروست ئەکا.

**قونتە:** کوڵە، قوڵە.

**قەبەرغە:** نێوانی هەر دوو شان کە قورسایی بار ئەکەوێتە سەری ف گُردە.

**قەپکەن:** بە قەپ هەڵپچڕاو.

**قەدەغەی هاتوچۆ:** ع حظر التجول، منع التجول ف حکومت نظامی.

**قەردار:** خاوەن قەرز، کەسێکە قەرزی داوە ف طلبکار.

**قەرزدار:** وام لەسەر، کەسێکە قەرزی لەسەرە ف بدهکار.

**قەرمەتی:** لە گرووپە توندڕەوەکانی شیعە، لە سەدەی دەی زایینی لە باتنیە یان ئیسماعلیە جیابوویەوە. ناوی قەرمەتی لە «حەمدانی ئەشعەب ناسراو بە قەرمەت» لە دامەزرێنەرانی قەرمەتیە، وەرگیراوە. قەرمەتیان بڕوایان وایە لە پاش جەعفەری سادق، ئیمامی شەشەمی شیعە چون کوڕەکەی، ئیسماعیل، پێش خۆی مردووە ئیمامەتی ئەگا بە «محەمەد کوری ئیسماعیل» بۆیە بە **حەوتەش** ناوبراون. بڕوایان بە ڕاپەڕین هەیە بە شمشێر و کوشتوبڕی نەیاران؛ ئەگەر ئەو نەیارانە موسڵمان و لە ئاینزاکانی تری ئیسلامیش بن. زیارەتی گۆڕستان و ماچکردنی بەردی کەعبە لایان حەرامە. تا ئەو ڕادەیەی کە هێرشیان کردە سەر کەعبە، حاجیەکانیان تاڵان کرد و فڕێیان دانە ناو بیری زمزم، دەرگای کەعبە و «حەجەرەلئەسوەد» یان لەگەڵ خۆیان برد. هەندێ لە مێژوونووسان ڕایان وایە دامەزرێنەرانی قەرمەتیان بڕوایان بە ئیسلام نییە و هەوڵیان بۆ تیابردنی ئیسلام و ژیاندنەوەی دینی زەردەشتیە، چونکە ئەوانە مەجووس (بە عەرەبکراوی موغ واتە زەردەشتی) و لەبەر ئەوەی ناوێرن بە ئاشکرا ڕای خۆیان دەرببڕن، ئەو ڕێگەیان هەڵبژاردووە. قەرمەتیان بڕوایان بە خوای دوانە، واتە خوا و گیان هەیە کە، **ئێزەدان** پێکەوە دنیای حەوتە (حەوت ئەمشاسپەند) بەڕێوە ئەبەن. هەروەها مارەبڕینی کەسی مەحرەم و خواردنەوەی شەراب لایان ڕەوایە. هەر کەس ئاگر بکوژێنێتەوە دەستی بپەڕێنن

و هەرکەس بە فوو بیکوژێنێتەوە، زمانی بقرتێنن.

**قەرەچی:** قەرەج، کاولی.

**قەرەوێڵە:** تەختی لەسەر نووستن.

**قەزاق:** نەتەوەی قەزاقی دانیشتووی قەزاقستان یان کازاخستان و هەندێ شوێنی ئاسیای ناوەڕاستن. بەڵام قەزاق هەروەها بەو گوندییانەی باشووری رووسیە و ئوکراین و پۆلۆنیا ئەوترا کە لە دەس ئاغەکان هەڵاتبوون و لە قەراخ چەمەکانی **دان** و **دنیپر** ئەژیان. ئەم گرووپانە وردە وردە خۆیان رێکخست و لە لایەن دەسەڵاتدارانی ئەو ناوچانە ئەرکی سنوورەوانیان پێ سپێردرا. کاتی هێرشی ناپلیۆن بۆ رووسیە قەزاقەکان بە جەنگی تەق و رەو ترسیان هاویشتبوویە دڵی سەربازە فەرانسەییەکان. یەکەی قەزاق تا کۆتایی حکوومەتی تزاری لە سپای رووسیەدا هەبوو. ناسرەدین شای قاجار پاش گەشتی ئوورووپا بریگادی قەزاق یان یەکەی قەزاقی لەناو سپای قاجار دامەزراند. رەزا قەزاق (رەزا شا) لەم یەکەیەدا خزمەتی ئەکرد.

**قەشان:** ئەسپی ناوچاو سپی.

**قەشقە:** شووم، نەحس.

**قەقنەس:** لێرەدا بەواتای سووتاونی بە تەواوەتی :: قەقنەس مەلێکی رەنگاوڕەنگ و زۆر خۆش ئاوازی ئەفسانەییە. ئەڵێن هەزار ساڵ ئەژی و کە ئەگاتە ساڵی هەزار و کۆتایی تەمەنی، لەسەر کێوێکی بەرز ئێزنگێکی زۆر کۆ ئەکاتەوە و لەسەری دائەنیشێ و دەس ئەکا بە خوێندن و باڵ راوەشاندن کە لە ئەنجام دا سەرخۆش ئەبێ و پزیسکەیەک لە باڵیەوە ئەکەوێتە ناو ئێزنگەکە، ئاگرێکی گڕەمەشخەڵان ساز ئەبێ و قەقنەس خۆشی لەو ئاگرەدا ئەسووتێ. لە ژێلەمۆی بن خۆڵەمێشەکەی هێلکەیەک بەدی دێ و قەقنەسێکی‌تر. قەقنەس یان سیمرخ یان ع عَنقا جووتی نییە و ئەڵێن مووزیک لە ئاوازی قەقنەس وەرگیراوە.

**قەڵاخ:** داری لەسەر یەک قەڵاکراو، چەن لێژنە داری لەسەر یەک کۆما کراو.

**قەڵاس:** داسووکە، گوڵە گەنم و جۆی لە داس هەڵوەریو، پرزەی گوڵە گەنم و جۆ.

**قەڵاسچن:** دەسکچن، دەسکەوان، ئەو مناڵ و مەزنانەی قەڵاس واتە گوڵە گەنمی هەڵوەریوی پاش دروێنەوان کۆ ئەکەنوە.

**قەڵتاس:** پرزەی گوڵە گەنم و جۆ، توێکڵی نۆک و پاقلە

**قەڵەمناریێ:** یارییەکی کوردییە لە شێوەی بەیسباڵی ئەمریکی.

**قەڵەندەر:** کەسێ کە گوێی لە داب و نەریتی کۆمەڵگە نیە، کەسی سەڵت و لە

دنیا دابڕاو، دەروێشی ئازاد و گەڕیدە؛ کەمتەرخەم، کەکەلا.
**قەڵەنگ:** قەلادەی ملی سەگ، پەتک.
**قەمتەر:** خەزێمی لووتی ورچ و وشتر کە بەنی تێئەخرێ، دەمبێنی پاتاڵ، مەهار. ئەگەر لە دار بێ پێی ئەوترێ **بەرس.**
**قەندیلە:** چرا پلیتە.
**قەنەفە:** کورسی درێژۆکەی سێ چوار کەسی، نیوکەت.
**قەننە:** سەبیلە، نێرگەلە، قلیان.
**قەنەوس:** کووتاڵێکی ڕەشی بریقەدارە.
**قیرقاج:** خوارەوخوار، لارەولار، قرژاڵی.



**کادوو:** دووکەڵی کا، دووکەڵ.
**کارستان:** کاری گەورە و مەزن و شاکار :: کارێکی کردووە کارستان: کارێکی مەزنی ئەنجام داوە.
**کارەبا:** جیوەی دارێکە زەرد و سووک و گرانبایی ئەکرێ بە بەرموور و تەسبێح؛ کارەوا، ئەلکتریسیتە.
**کاژەرە:** کاسەی سەر.
**کافەرمان:** چەقۆی دەلاکی.
**کالان:** بەرگی شمشێر و خەنجەر.
**کالانە:** چاڵی چاو، ئێسکی دەور چاو.
**کاڵە:** پێڵاوی چەرمینی گوندییان لە تۆفی سارد و سەرمادا؛ جۆرێکی لە لاستیکە و پێڵاو ئەخرێتە ناوی: کالە و پێڵاو.
**کاو:** جووڵە، گەڕان، کایە، وازی؛ جووڵان لە شەترنج و دامەدا.
**کاولی:** قەرەچی، دۆم.
**کاوێر:** چاڵووک، تەنگز.
**کاهوور:** سەرەنێزە، قەمە، سیکارد.
**کایە:** مەیدان، گۆڕەپان؛ وازی، یاری.
**کتوپڕ:** مافەتە، نەخۆشیەکە ئەدا لە ئاژەڵ گێژ ئەبێت و لووتی دائەژنێ.
**کراڵک:** گیایەکی دڕکاوییە بە تۆپەڵ ئەڕوێ.
**کروکاش:** کۆکردنەوەی گوڵەگەنم و گژوگیا.
**کرویَ:** درمێکە ئەدا لە میوە.
**کرووز:** پرچن، سەر بنەگەون، قژن.
**کرێڤ:** ناوبرا، زرکوڕ ☐ پسر خواندە، برادر خواندە.
**کلا:** لە کلابوون: جیابوونەوە.
**کل دان:** کلا کردن، لادان، ناردن.
**کلێتە:** سەرکڵاو.
**کڵاوبۆرە:** کلۆز، کڵاوی لباد، کڵاوی دەوستکراو لە تەحتی.
**کلۆج:** جۆر، شێوە، شێواز.
**کلۆز:** کڵاوی لباد، کڵاوی دەوستکراو لە تەحتی.
**کۆترە:** ئەستوندەک، داری ڕاگرتنی

خێوەت، کارتیە.

**کۆچەک:** بەچکەی وشتر.

**کۆز:** پەچەی مەڕ، خەلان، خەڵ، سەرگێڕ، شوێنی کار و بەرخ، هەویز، هەوێس.

**کۆزەرە:** چەتی خەرمان، درشتەی لە گێرەدا نەهاڕدراو، گوڵەجۆ.

**کۆلکە و تاپۆ:** ﻑ ثبت سجل و اسناد ﻑ تسجیل اسناد و عقار.

**کۆلۆز:** کلێتە، کڵاوی لە بەن چندراو.

**کۆڵوو:** بنجی تاڵوو کە ئەستوورە و بۆ سووتاندن ئەبێ.

**کۆڵەوەژ:** دارێکی درێژە ئاگری تەنووری پێ خۆش ئەکەن.

**کۆن:** رەشماڵ، خێوەت.

**کوان:** دمەڵ.

**کوچک:** بەرد، کەڤر :: کوانووی سێ کوچکە: کوانووی سێ بەرد، کوانووی سێ قاچ، کوانووی سێ سووچ.

**کوخت:** ماڵی هەژارانە ﻑ خراپە، کلبە.

**کورک:** کوڵکەی ورد.

**کولۆش:** درواوی دانەوێڵە.

**کوفارە:** فوارە، کوڵکوڵە.

**کولاوکە:** کڵاورۆژنە.

**کولمە:** گۆنا، پارچە گۆشتی بێ ئێسک :: کولمەی مەمک، کولمەی سمت، کولمەی ران.

**کوێت:** ئەسپی سووری ئاماڵ ڕەش.

**کوول:** ئەشکەوتی فراوان و درێژۆکە وەکوو هۆدە :: کوولی خەسرەوخان لە سەرشیوی سەقز.

**کەپۆ:** لووت، بێقڵ.

**کەتن:** جنحە :: کەتن و تاوان: جنحە و جنایت.

**کەتنکەر:** ئەو کەسەی بە هۆی کەتن کردنەوە لە دادگا مەحکووم کراوە.

**کەحیل:** کەحلان، رەسەن، سۆلان، نەجیب.

**کەرپووچ:** خشتی سوور، ئاجوور.

**کەرەنا:** دووکەڵکێش.

**کەستەک:** قوڕ، کەرسەک، تۆپەڵە قوڕ، قوڕی وشکەوەبوو.

**کەسەخ:** بەرەک.

**کەسم:** بیچم، سەروسیما، رواڵەت.

**کەسمۆک:** رەبوو، ئاسم.

**کەش:** نەپێکان.

**کەش:** سنوور.

**کەش:** کێشەر، راکێشەر، جازیبە.

**کەش:** هەسارەی زوحەل یان ساترن.

**کەشکەی ئەژنۆ:** کەشکەژنۆ، ئێسکی خڕی ئەژنۆ.

**کەشەفە:** سینی.

**کەشەنگ:** شەکەت، ماندوو، هیلاک.

**کەفتەیی:** نەخۆشی گرانەتا، تیفووس.

**کەکرەی مار:** ژەهری مار.

**کەلایی:** کەربەلایی، ئەو کەسەی بچی بۆ زیارەتی کەربەلا پێی ئەوترێ کەلایی.

**کەلەندەر:** ماڵەغان، کەرەمتوو.

**کەلیلان:** سۆ، تاسە، داخ و عەزرەت ف حسرت، افسوس.

**کەڵان:** گەورە، مەزن.

**کەڵکەڵە:** خولیا، وەسوەسە.

**کەڵۆت:** کەفەڵ.

**کەڵەمە:** تەوقی ملی گا، چەڵەمە.

**کەوشەن:** سنوور، هێڵی جیاکەرەوە؛ سنووری دەسەڵات.

**کەلەش:** جوان چاک، قۆز، بوێر.

**کەڵەش:** تەرم، جەندەک، لاشە.

**کەما:** گیایەکی بەرزی گەڵا دەرزییە :: لۆ و کەما :: قرچکی کەما لە هەموو قرچێک باشترە.

**کەموون:** زیرە.

**کەمەرە:** پەڕانپەڕ، دەفەر، ژینگە، بازنە ف محیط E Circle.

**کەمەندکێش:** سرووش، دەنگی پێوار، دەنگی لە غەیبەوە؛ ملکەچی و سەرسپاردن لە بەرامبەر کەسێکی تردا؛ یەخسیری داوی ئەڤین و خۆشەویستی.

**کەنوو:** کەندوو، کوار، شوێنی پاراستنی دانەوێڵە، سایلۆ.

**کەنەفت:** کز و لاواز، زەلیل، لارەمل.

**کەنی:** ئافرەت، ژن :: کەنیشک: کەنی بچووک واتە کچ.

**کەوڵۆس:** کەسێک ددانی پێشەوەی نەبێ.

**کەونارا:** زۆرکۆن، دێرینە.

**کەووگ:** خۆڵەمێشی، بۆر.

**کەوەمار:** ماری ئەفعی.

**کەوی ١:** تێکەوی :: تێکەوتن.

**کەوی ٢:** داخ؛ گەرم داگیرساو.

**کەوی ٣:** رنوو، کلیلە، گلێرەوە بوو.

**کەویر:** قاقڕ، زەوی بێ ئاو و رووتەن و شۆرەزار.

**کەی بانوو:** گەورە بانوو، شاژن، خاوەن شکۆ.

**کێشە:** بارکێشان، گواستنەوەی کوڵۆش لە شاراوە بۆ سەر **خەرمان** ::گێرە و کێشە.

**کێشەر:** راکێشەر، جەزبە.

**کێلوون:** ئەشکۆڵ.

**کێوی قاف:** ☜ قاف.

**کیتەڵە:** دیزەی چکۆلە.

**کیرکردنەوە:** چیرکردنەوە، جیرکردنەوە.

**کیسە لێدان:** شۆردنی مرۆڤ بەیارمەتی کیسە و نیمەشۆرە بۆ ئەوەی چڵکی لێ ببێتەوە، پاشان بە لفکە و سابوون. هۆکەشی وا پێ ئەچێ درەنگ درەنگ بۆ گەرماو چوون بووبێ، هەرچەند بە جۆرێک وەک ماساژدانی پێست وایە.

**کیل:** کێل، ئایەرە، پەیمانە.

**کیم:** چڵک، چڵک و پیسایی ناو کوان.



**گارس:** هەرزن.

**گارمۆن:** ئامێرێکی موسیقای رووسی لە خێزانی ئاکاردیۆن، لە رووسیەوە بۆ گورجستان و قەوقاز و لەوێشەوە چووەتە ئێران، لە مووزیکی ئازەریدا بەزۆری سوودی لێوەرئەگیرێ.

**گازڵ:** گوێزەڵ، چاوگەش.

**گازەنگ:** زەنگۆڵەی گەورە، ئەکرێتە ملی وشتری پێشەنگ کە زرنگانەوەیەکی بەگێزی هەیە.

**گاوانی:** شەرتە، شوان؛ ریشۆڵە، سێرۆ.

**گاوکردن:** لکاندنەوەی چینی شکاو بە تێل.

**گاوەناس:** دارەتێکە کەف لە دەمی گا دێ و ماتی ئەکا.

**گراو:** گیراو، دیل، یەخسیر؛ ئەویندار، بریندار بە تیری عەشق.

**گرژینەوە:** نەرمە خەنینەوە.

**گریک:** حەجمان، توان، تاقەت.

**گرئەستێرە:** شۆڵە ف شهاب.

**گرسۆز:** لامپا.

**گرکەمارانە:** گرکەتاڵە، شووتی مارانە.

**گرۆز:** ورکگر.

**گزگل:** یەکێکە لە حەوت بەری داری بەڕوو؛ بە مرۆڤی پیسەکەی لەڕ و لاوز ئەگوترێ و زیاتر بۆ منالْ بەکار ئەبرێ.

**گزەون:** گزیکەر.

**گزیچار:** تەڕە شووڵی دەوەن کە بۆ تەمێ کردن بەکار ئەهێنرا.

**گشت:** بادراو، باوخواردوو.

**گشتەک:** بەنی گشت، بەنی کلاش چنین، بەنی پینەچی.

**گلەخۆرکە:** کرمی گڵی، کرمە سوورکە.

**گۆ:** ئاخافتن؛ هەست و پێزانینی ئەندام.

**گۆترە:** مەزەندە نەکراو، ئایەخ E imponderable.

**گۆچانی نوقڵ:** نوقڵێکی رێرێی سپی و سوورە لە شیوەی گۆچان.

**گۆخڵ:** مەرەزەوان.

**گۆرمار:** کەوەمار، ئەفعی.

**گۆشپاق:** ژێرپیاڵە، پێشدەستی، زیرە، قاپێکی پەلی تایبەتە گۆشتی تێ ئەکرێ.

**گۆیار:** ئێشکگری قەڵا.

**گودیلە:** کاکۆڵ.

**گورپ:** تۆپەڵ.

**گورپ کردن:** پیش خواردنەوە، بە مۆنی خۆ گرمۆڵە کردن؛ تۆپەڵبوونی لۆکە.

**گورگ‌چواو:** کەسێکە گورگ تۆقاندبێتی، وەک مارانگەستە.

**گورگەلۆقە:** جووڵان و بزوانی خێرا و

بەپەلە، تاکتیکی جێگۆڕکێ کردن لە شەڕدا 🄵 جنگ و گریز.

**گوژم:** تەکانی بە تەوژم، هێرش، پەلامار.

**گوڵبێنە:** کونێکە بۆ بابوێری و گڕ خۆش بوونی تەنوور لە بنەوە دروست کراوە.

**گوڵخەن:** توونی گەرماو.

**گوڵمێخ:** بزماری گەورەی سەریان.

**گوڵی پۆپەکەڵەشێر:** گوڵێکە شێوەی لە پۆپەی کەڵەشێر ئەچێ 🄵 گل تاجخروس.

**گومەت:** گومەز، قوببە.

**گونگ:** نارِوون.

**گووران:** رسکان؛ گیان بە بەرداهاتنی پیزە یان پیزۆکە؛ لە پێست دەرهاتن.

**گووراو:** رسکاو، لە توێکڵ دەرهاتوو.

**گەپجاریی:** گاڵتەجارِیی.

**گەداجۆش:** حەوجۆش، کتری ئاسنی رەش.

**گەدە:** منالێکە ئەخرێتە بەر کارکردن لە ماڵان 🄵 نوکەر.

**گەردەلوول:** باهۆز، گژەبا.

**گەرک:** شووڵ و داری درەختی گەز :: شووڵ بۆ سەبەتە و دار بۆ دەسکی کەرەمتوو.

**گەرماوەز:** وەرزی گەرما.

**گەرناس:** بوێر، ئازا لە شەڕدا.

**گەز:** گزیچار؛ گەزۆ؛ پێوەرێکە بەرامبەر بە سەد و چوار سانتیمەتر؛ شۆکەی دارودرەخت.

**گەزلک:** جۆرە چەقۆیەکی نووک تیژ وەکوو کێرد کە تێغەکەی بەسەر دەسکەکەیدا نانوشتێتەوە.

**گەزمە:** پاسەوان.

**گەلی:** گەڵی، دۆڵ، دەرە، شیو.

**گەڵوازە:** چنراوی رەنگاوڕەنگ بە زەنگیانە کە بەسەر بێشکە و شتی وادا هەڵئەواسرێ.

**گەناو:** ئاوی وەستای بۆگەنگردوو.

**گەنجەفە:** پەڕەی یاریکردن؛ یارییەکە لە سەردەمی سەفەوییەکان بووە بە باو، ئەم یارییە بە شێوەی یاری حوکمە کە ئەمرِۆ باوە و پێی ئەچێ لە یاری حوکمی ئورووپاییەوە وەرگیرابێت.

**گەوارە:** گەواڵە، پەڵە هەور 🄵 ابرپارە.

**گەواشە:** کوول، ئەشکەوتی فراوان و درێژۆکە وەکوو هۆدە.

**گەواڵە:** گەوارە، پەڵە هەور 🄵 ابرپارە.

**گێپەرە:** ملی پۆستاڵ، ساقەتی پۆستاڵ.

**گێژەڵووکە:** باهۆز، گەردەلوول، گێژەڵە.

**گیاسرە:** گیایەکە هاوینان لە گۆزەی ئاوی دەئاڵێنن بە فێنکی رای ئەگرێ.

**گیشە:** چەن بار گیای دووراو ☜ مەلۆ.



**لاپر:** نەناس، بێگانە.

**لاپرەسەن:** کەس نەناس، لاپرە، خۆ تێهەڵقورتێنەر، بێگانە ف فضول، لاقید.

**لادەری:** لەتی دەرگا، لەتە دەرگای دووکان کە لە چوار پێنج پارچە پێکهاتبێ.

**لاڤ:** لالانەوە، پاڕانەوە.

**لالا:** درەخشان، درەوشاوە، نازناوە بۆ ئافرەت.

**لاوار:** داروپەردوو، رووخاو و کەلاوە ف آوار.

**لباد:** کولاڤ، بەرگنی پەستاو.

**لفکە:** لۆ، باڵی لەچک و سەرپۆش.

**لم:** رلم.

**لنگارگرتن:** ئاژووتنی خێرا و بەگوڕ، مین گرتن.

**لۆتەر:** گورجوگۆڵ.

**لۆخەندان:** فیشەکدان، زەر، رەخت.

**لۆدە:** چەن باخە گیای دووراو.

**لۆقە:** غاردانی لەسەرخۆ و بەنەرمە.

**لۆک:** وشتری نێر.

**لۆگۆ:** نیشانە، بەرژەنگ، ئارم.

**لۆمنی:** Louis de Loménie (١٨١٥ – ١٨٧٨) سکوولار و وتارنووسی فەڕانسەیی.

**لوان:** گونجان.

**لەچەر:** پەلپ گیر؛ رژد، رەزیل، چەکووس.

**لێ:** بەلام، هەروەها.

**لوێچ:** پڕ لەپی دەستێک.

**لەپەسا:** بەردەوام.

**لەتردان:** رەتلدان، سەرسمدان.

**لەچەر:** رژدی، چرووک، هیچکە، تەرەس، خوێڕی.

**لەخت:** بەدەن، لەش، ئەندامانی لەش بە تێکڕایی.

**لە گۆ کەوتن:** لاڵ بوون، لە قسە کەوتن، زمان لە ئاخاوتن رامان؛ سڕ بوون و تەزین بە هۆی سەرماوە.

**لەمپەر:** رێگر، کۆسپ، بەربەند.

**لەهیی:** لافاو، سێلاو، لێشاو، لاسامە.

**لەیلاج:** ئەبولفەرەج محەمەد کوڕی عەبدوڵلا، لە سەدەی چوار و پێنجی کۆچی بەرامبەر بە سەدەی یانزەی زاینی ژیاوە، وەستای یاری شەترەنج و تاوڵە و سێ قاپ بووە، بۆیە بە پیری قوماربازان ناوی دەرکردووە. باوکی لە حاکمانی هیند و سەر بە خولەفای بەنی عەباس بوو. لەیلاج بە گەنجی چوو بۆ هەمەدان و لەوێ کەوتە زیندان، هەرچەند بە یارمەتی ئەبوو عەلی سینا لە مردن رزگاری بوو بەلام دەستی چەپیان بڕی. لەیلاج چەن ساڵێک تەرکە قوماری کرد بەلام گەڕایەوە سەری و لە یارییەکدا دار و نەداری دۆڕاند و دیسانەوەش بە یارمەتی ئەبوو عەلی سینا دەرباز ئەبێ ئەچێ بۆ شیراز و لە گوڵخەنی

یەکێک لە گەرماوە کۆنەکان نیشتەجێ ئەبێ. جا بەم پێیە ئەو کەسانەی کە لە قوماردا شارەزا و زیرەکن و ئەو منالآنەش کە لە یاری وەکوو هەڵماتێن و چالێن و واخێن و هێلکە شکێنەدا وشت و وریا بن پێیان ئەوترێ لەیلاج. ئەمەش بە دوو مەبەست ئەوترێ یەکیان بۆ ئافەرین کردن :: لەیلاجێکە بۆ خۆی و؛ ئەوی کەش بۆ وریاکردنەوەیە کە ئاگات لەخۆت بێ و ژیانی خۆت نەفەوتێنی :: نەبی بە لەیلاج باشە! ئەگێڕنەوە باوکێک کە کوڕەکەی ماوەیەکە فێری قومار بووە، ئەبا بۆ لای لەیلاج ئامۆژگاری بکات. لەیلاج سێ قاپ هەڵئەدا بۆ سەربان و بە کوڕە ئەڵێ بچۆ سەیریان بکە، دوو **چەق** و **تەفێک** هاتووە. کوڕە ئەچێ سەیر ئەکا، دێتەوە خوارەوە و ئەڵێ وایە. لەیلاجیش پێی ئەڵێ من شازادەم و بە دەستی بڕاووەوە لە تونی گەرماو ئەژیم، هەرچەن قاپ بە حەواوە ئەخوێنمە، کەوابوو بزانە قومارباز هەمیشە دۆڕاوە و قومار بردنەوەی نییە ئەگەر هەزار جاریش بیبەیتەوە.

**لێژنە:** دار و ئێزنگی لەسەریەک دانراو.



**ماخۆلە:** نەخۆشی شیزۆفرنی کە نەخۆش خۆی بە کەسێک یان شتێکی تر ئەزانێ.

**مارۆ:** ئەسپە رەشی ناوچاو سپی.

**مافنگی:** مایەپووچ.

**مافەتە:** کتوپڕ، نەخۆشیەکە ئەدا لە ئاژەڵ گێژ ئەبێت و لووتی دائەژنێ.

**ماڵبەند:** ئەو گوڵمێخەی لە دیوار چەقێنراوە، رەشمەی چارەوای لێ گرێ ئەدەن.

**مامزە:** مامێز ☞ مهمیز.

**ماوزێر:** دەمانچە و تفەنگی مارکی کارگەی ماوزێڕی ئالمان.

**ماووت:** چۆغەیەکی تەنراوی خاوداری بەنرخە، کووتاڵێکی پەشمینی ئەستوور و گرانباییە.

**ماووتماڵ:** فلچە یان بووسێکی تووک رەقە پاڵتاو و جاکەتی ماووتی پێ خاوێن ئەکەنەوە.

**ماهەک:** ماک، گەوهەر، رەگەز.

**مایەبۆش:** سیک، مایەپووت، نابووت.

**مایە پووچ:** مافنگی، نابووت. مایەپووت.

**مایەفیتنە:** کولەفیتنە، ئاژاوەچی.

**مایی:** ئەتەوێ (بەلووچی).

**مجرۆ:** سەقەت، فەلەج.

**مجری:** یەغدانی بچکۆلە، سندووقی بچکۆلەی شوێنی هەڵگرتنی شمەکی وردی بایەخدار.

**مراز:** مەراز، نیاز، ئارەزوو.

**مرخ خۆشکردن:** تەماح تێکردن.

**مزگەوتی شین:** یان مزگەوتی پیرۆزرە، بە ئازەری گۆی مەسجد و بە فارسی مەسجد کەبوود، لە بینا مێژووییەکانی تەوریزە، ساڵی ١٤٦٥ی زاینی کچی جیهەنشای قەرەقۆیونلوو فەرمانی دروستکردنی داوە.

**مژ:** تەم، بۆق، هەڵم :: تەم و مژ، هەڵم و بۆق؛ قومدان لە سیگار.

**مژۆڵ:** برژانگ.

**مژی:** ئاوەز، هزر.

**مشکولۆزمە:** ئۆباڵ بەگەردن.

**مفتە:** خۆڕایی، مشە.

**مفتەخۆر:** مشەخۆر.

**مگیرانی:** بێزوو.

**ملیوان:** یەخەی کراس.

**ملۆزم:** مێمل، کروێ.

**منەکردن:** بەدوودا گەڕان، بۆگەڕان، بەشوێندا گەڕان، لێگەڕان.

**مۆڕ:** رووگرژ، مۆچ، زۆپ.

مۆری سوور: Cachet Rouge لە بەرهەمەکانی ئالفرێد دو ڤینی.

**مووزات:** موعجیزە.

**مووشکردن:** مۆن بوون و قوڕوقەپکردن.

**مووشەدەمە:** هەمبانەی هەوا.

**مەتە:** ئامێری شت کونکردن.

**مەحف:** لەبەین چووگ.

**مەرگان:** واتە راوچی. مەرگان، کەسایەتی سەرەکی ڕۆمانی «جێگەی بەتاڵی سلووچ»، نووسینی مەحموودی دەوڵەت ئابادی، وەرگێڕانی ئەمین گەردیگلانیە، کە لە وەرگێڕانی کوردییەکەدا مێرگان نووسراوە. دەوڵەت ئابادی بۆ خۆی لە چاوپێکەوتنێکدا ئەڵێ: «...لە منالیەوە ئەمبیست کە ژنێک هەبووە بە ناوی مەرگان و یادی بەخێر باوکیشم پێی وابوو کە وشەی مەرگان (ق مَرگان با زَبَر میم) واتە بکوژی نێچیر.» لە فەرهەنگی دێهخودا مەرگان بە واتای راوچی هاتووە. مەرگان هەروەها ناوی **فیلمێکی کوردییە** کە دەرهێنەر جافری نوورمحەمەدی، لە گوندی شێروانەی خوراسان سازی کردووە و، ساڵی ٢٠٠٩ خەڵاتی یەکەمی **یەکێتی ئێزگەکانی ئاسیا و ئوقیانووسیەی** Asia– Pacific Broadcasting Union (ABU) وەرگرتووە، بەسەرهاتی مێرمنداڵێکی ١٣ ساڵانە کە توانایەکی زۆر چاکی لە لاسایی کردنەوەی دەنگی مەلدا هەیە و راوچیەکان بۆ گرتنی کەو کەڵکی لێوەرئەگرن، کۆتاییەکەی کیژە مامۆستای گوند ئەتوانێ کورە راکێش بکات بۆ فێرگە. ئەمە ئەیگەیەنێ وشەی مەرگان لەناو کوردی خوراسان باوە، لێرەشدا مەرگان، بە واتای بکوژی بێبەزەیی بەکارهێنراوە

که ئەیەوێ بە هەزار فڕوفێڵ خاوی نێچیرەکەی ببەستێ و بیخاتە داوەوە.

**مەزاخ:** تێچوو، خەرج، پارەیەک بۆ کارێک خەرج ئەکرێ ⓕ هزینە.

**مەزدەک:** مەزدەک کوڕی بامداد، سەدەی پێنج و شەشی زاینی، لە ئیستەخری فارس، لە سەردەمی قوبادی ساسانی داوای پێغەمەریتی کرد و بزووتنەوەیەکی کۆمەڵایەتی پێکهێنا کە بە کۆمۆنیزمی ئێرانی ناوبراوە.

**مەزڵ:** مەنزڵ، شوێنی مەبەست.

**مەشتی:** واتە «مەشهەدی»؛ ئاوەڵناوێکە وەکوو حاجی، لە ناو شیعەی ئێراندا ئەوانەی بچن بۆ زیارەتی ئیمام رەزا لە شاری مەشهەد پیان ئەوترێ «مەشتی» و هەر بەو پێوانەیە بە زیارەتکەرانی کەربەلا ئەوترێ «کەلایی».

**مەقاش:** مقاش، ماشە، پەنگر.

**مەلی مەرگ:** مەلی مەرگ، لەبری (ⓕ مرغ بسمل) دانراوە. «بسمل» بە واتای کوشتنە، «بسمل کن» واتە بیکوژە. لە فەرهەنگی جۆراوجۆردا هەرووها بە واتای قوربانیکراو هاتووە. بە کوژراوی نیوەگیان ئەڵێن. کوژراو و بە واتای قوربانیکردنیش هاتووە. کوژراوێکە بە تەواوەتی گیانی دەرنەچووە. کوژراو، مل براو، نیوەگیان، سەربڕاو. لەوەوە هاتووە کە کاتی کوشتنی قوربانی «بیسمیللا» ئەڵێن.

**مەڵۆ:** باوەشێک گەنمی دووراو، بریتییە لە دوو گەشتانە؛ گەشتانە چەن قولە، سێ مەڵۆ باخەیەکە، چەن باخە لۆدەیەک، دوو لۆدە بارێک، گیشە یان شارا چەن بارە و کۆی گیشەی دووراو خەرمانە :: **قول**، **گەشتانە**، **مەڵۆ**، **باخە**، **لۆدە**، **بار**، **گیشە** یان **شارا**، **خەرمان**.

**مەن:** کێشێکە بەرامبەر بە سێ کیلۆ.

**مەنداو:** ئاوی وەستاو، گۆلاو.

**مەندەر:** دۆشەکڵە.

**مەنسووری حەلاج:** لە عارفانی سەدەی سێیەمی کۆچی، نۆیەمی زاینیە. لە گرنگترین سۆفیەکانی سەردەمی خۆی بووە و لەکاتی کێشەری عیرفانیدا «انا الحق»ی وتووە و لە لایەن پێشڕەوانی دینەوە سەرەتا بە «کفربێژ» و پاشان بە قەرمەتی ☜ **قەرمەتی** یان ئیسماعیلی ☜ **سەباح**، تاوانبار کرا. پاش هەشت ساڵان بڕیاری کوشتنی درا؛ لە بەغدا، بەردەباران کرا، بەڵام نەمرد، لووت و گوێیان کرد، بەڵام هەر خەریکی نزا کردن بوو تا زمانیان بڕی کە ئاسمان رووی گرژ کرد و ئاوی دەچڵە هەڵسا و کاتێکە خۆڵەمێشەکەیان کردە ناو ئاوەکە، ئاوی راساو دامرکایەوە. ئەوسا کە حەلاجیان ئەبرد بۆ کوشتن لێی پرسرا راستی، واتە

حەق چییە کە تۆ ئەڵێی «اناالحق»؟ حەللاج لە وەڵامدا وتی: ئەمرۆ و بەیانی و دووبەیانی خۆتان ئەیبینن؛ ئەمرۆ کوشتیان، بەیانی سووتاندیان و دووبەیانی خۆڵەمێشەکەیان دا بە دەم باوە.

**مەنەک:** ڕەکاب :: مەنەک بە مەنەک: پێ بە پێ، ڕکێف بە ڕکێف.

**مەوج:** چنراوی لە جاجم ناسکتر و لە پۆپەشمینە ئەستوورتر وەکوو لێفە بەکار ئەهێنرێ.

**مەیداندار:** بەو کەسە ئەوترێ کە لە ناوەڕاستی زۆرخانە ئەبێ بە ڕاهێنەر :: مەیدانداریکردن لە دەرەوەی زۆرخانە بە واتای کەڵەگایی کردن و خۆ گیف کردنەوە بووە بە باو، واتە بەبێ ئەوەی شیاوی بێ پێ لە شوێن پێی مرۆڤی مەزن دائەنێ، بەتایبەت کە یەکێک لە فرۆزە گرنگەکانی پاڵەوان خاکەڕایی و مل بەکوێن بوونە.

**مێخ:** بزمار.

**مێدووسا:** Medusa لە میسۆلۆژی یۆنانیدا ماخوایەک بوو بە بسکی مارەوە سەیری هەر کەسی بکردایەت ئەیکرد بە بەرد؛ هەروەها جۆرە ئەستێرەیەکی زەریاییە کە لە ئاوەکانی فەڕانسەدا زۆرە.

**مێشێن؛** هەڵماتێن، کەلایێن.

**مێلوورە:** مێرووله.

**مێزەر:** سەرپێچ، مشکی و شەدەی کوودەری.

**مێلاو:** مەلەوان.

**مێمڵ:** ملۆزم.

**مینگرتن:** دەورهەڵگرتن، گەرم داگیرسان :: مینگرتنی شەلاق و مەزرەق.

**مینەگ:** چوارپێی سواری و بارکێشان.



**نادر:** نادرقولی، تەهماسب قولی خان یان نادر شا، دامەزرێنەری حکومڕانی تورکی ئەفشار، سەدەی هەژدەی زاینی.

**ناس:** گەڵای وشکی گیایەکە وەکوو تووتن، نەرم ئەیکوتن و تۆزێ کلسی تێکەڵ ئەکەن ئەخرێتە نێوان لێو و ددان.

**ناسۆر:** برین و غەم و پەژارە.

**ناکار:** ئازار و جەزرەبە پێگەیشتوو :: ناکارکردن: لەکارخستن، جەزرەبە پێگەیاندن.

**ناڵبەکی:** ژێرپیاڵە.

**ناواخن:** ناوەرۆک، ئەو شتەی ئەخرێتە ناو شتێکی ترەوە؛ ناواخنی پشتوێن.

**ناوازە:** نادر، کەم وێنە.

**ناوگۆرک:** ئاگردانی ناو رەشماڵ.

**ناوە:** دەفری قورکێشان.

**نایب:** بریکار، جێگر.

**نسکۆ:** شکستی هێنان، هەڵەنگووتن،

لێقەومان، سەرسم.

**نموود:** قەڵافەت، دیمەن :: کابرایەکی بێنموودە، باوکی زۆر بە نموود بوو.

**نۆبەتێ:** ماڵاڕیا.

**نۆددان:** کەس یان گیاندارێک کە تازە ددانی دەرهاتبێ.

**نۆژەن:** نوێکردنەوە.

**نۆژەنقانی:** restoration کردەوەی گەڕانەوەی هەر شتێک بۆ خاوەنەکەی. لە مێژووی فەڕانسە بە خولی گەڕانەوەی بۆربۆنەکان بۆ دەسەڵات، پاش ئیمپراتۆری یەکەم ئەوترێ، کە لە هونەری کەلوپەلیشدا ڕەنگی داوەتەوە.

**نواڵە:** بابۆڵە هەویر کە ئەدرێ بە پاتاڵ بە تایبەتی وشتر، قەپاڵ، دەسکێ گیای دووراو.

**نوخشە:** نۆبەرە، نزای چاکە بۆ کەسێک :: نوخشە بێ لە تۆش!

**نوێژگە:** مصلی: لە «صلاة»ی عەرەبی واتە شوێنی نوێژ خوێندن، بەڵام لە زۆر لە شارە فارسەکان وەک شیراز و مەشهەد بە سەیرانگەی دەرەوەی شار ئەوترێ و ڕەنگە نوێژیشی لێ خوێنرابێ. مصلی لە وڵاتانی عەرەب مزگەوتی تایبەتە کە حەوشەی گەورەی هەیە و نوێژە بارانە و لەو بابەتەی لێ ئەخوێنرێ. حەوشەی نوێژگە ئەکەوێتە پشت مزگەوتەکەوە لەبەر ئەوەی خەڵکەکە ئەبێ لە پشت سەری بەرنوێژەوە بوەستن.

**نوێڵ:** باری.

**نەجما:** ناوی عاشقێکە لە دووری یارەکەی بە ناوی ڕەعنا شیعری وتووە و شیعرەکانی دەم بە دەم گەڕاوە؛ چیرۆکی دڵداریی وەکوو شیرین و فەرهاد :: ...شەوانی زستان لە ماڵی ریش سپی خێڵ کۆ ئەبوونە و چیرۆکبێژ سەربردەی وەکوو نەجما و شیرین و فەرهاد و... بۆ ئەوتن.

**نەخوازە:** نەخوازەڵڵا، بەتایبەت.

**نەخون:** ئەسپێک کە قوونی بڵیندە و ملی نەوییە.

**نەرمەناسە:** هەناسەدانی مرۆڤی خەوتوو. دەرباز بوونی هەناسەیە بە ئاسوودەیی لە کاتی خەوتندا :: پرخە: دەنگی کەپۆی نوستوو ع ف نَفیر.

**نەزمیە:** ئاسایش، پولیس. شورتە.

**نەشە:** کەیف، سەرەتای سەرخۆشی و مەست بوون.

**نەعرەتە:** نەڕە، قریوەی بەرز و گەورە.

**نەعمەتوڵڵای وەلی:** یان شا نەعمەتوڵڵای وەلی ماهانی کرمانی کە بە ڕەچەڵەک کوردە، هەرچەن دیوانێکی گەورەی بە زمانی فارسی هەیە بەڵام **نوخشانە** یا «پیشگوئی شاه نعمت‌الله» ڕاستەوخۆ لە پێشبینیەکەی **عێل بەگی جاف** ئەچێ؛

شا نەعمەتوڵڵا لە شاعیران و عارفانی سەدەی پانزەی زایینیە، ڕێبازێکی نوێی لە سۆفیگەریدا داهێنا و بە پیری دەروێشانی نەعمەتوڵڵایی ئەناسرێ.

**نەگبەت:** هەژار، ڕەبەن.

**نەمرچ:** نەدوو، مۆن.

**نەواخت:** ڕواڵەت، ڕووکار، شێوە؛ هەوا.

**نەوازە:** نەزانراو، گونگ، پێوار.

**نەواقە:** ناوچە، مەڵبەند، کەوشەن.

**نەوژ:** ئەفرا، سپیندار.

**نهالی:** دۆشەک و پشتی لە پەلاس و بەڕە چاککراو.

**نێزەک:** شۆڵە، گڕئەستێرە 🄵 شهاب.

**نهێم:** تەوژم.

**نیوکەت:** کورسی درێژۆکەی دوو سێ کەسی، قەنەفەی تەختە.

**نیهیلیزم:** وەرگیراو لە nihil ی لاتین بە واتای هیچ، بۆچوونێکی فەلسەفیە ژیان بە بێ واتا و ئارمانجی دەرەکی یان ئاکار و ڕەوشتی دەروونی ئەزانێ، ئەم بۆچوونە لایەنگری لۆجیکی زانستیە و فۆرمێکی تایبەتی پۆزیتیڤیسم و ماتریالیزمە، ڕاپەڕینێکە دژی هەموو ڕێسایەکی کۆمەڵایەتی و، دژایەتی کردنە لەگەڵ حکوومەت و ئاین و خێزان. پێی وایە زانست چارەسازی هەموو گرفتەکانی کۆمەڵە. نیهیلیزم، یەکەمجار لە سەدەی نۆزدەی زایینی لە ڕۆمانی بەناوبانگی ئیڤان تورگنیف بەناوی باوکان و کوڕان لە ڕێگەی کەسایەتی بازارۆف ـەوە بڵاوبوویەوە.

**وار:** پاچرا، پارەیەکە لە کاتی بردنەوە لە لایەن خاوەن قومارخانەوە وەرئەگیرێ.




**وارش:** دیوار، سیاج.

**واگوزار:** سپاردە، سپاردن.

**وافوور:** ئامرازی تریاک کێشان.

**وچان:** پشوودان، حەسانەوە.

**ودم:** نزای چاکە، پێوقەدەمی چاکە، نەفەسی بە باشە :: ودمی پیرۆزە.

**وڕاوە:** وڕینە، قسەی بێهۆشانە.

**ورتە:** قسەی لەژێر لێوانەوە.

**وڕک:** گڕوو، بیانوو.

**وەرسەڵ:** ئێسکبەندی پێشەکانی لەش.

**وڵسات:** ئاژەڵ و پاتاڵ، گاوگۆڵ.

**وەبا:** کولێرە.

**وەرجا:** هەرماو، مەندۆخ، هەمیشەیی.

**وەرجاوەند:** هەرماو، وەرجا، مەندۆخ.

**وەرد:** لە جارێک پتر کێڵراو.

**وەردیان:** زیندانبان.

**وەنەدی:** دەریچە، پەنجەرەی بچکۆلە، جامخانە، ویترینی شووشە.

**وەوی:** بووک.

**وەیل:** تەنووری وەیل: ناوی بیر یان دۆڵێکە لە دۆزەخ.

**وێر:** پارە لە باتی خەڵکدان لە چاخانە و چێشتخانە.

**وێرغە:** رۆینە، نەرمە غار.

**وێڵ:** مرۆی ئاوارە و بێ جێورێ.

**وێناکردن:** هێنانە بەرچاو ف تَجَسّم کردن، تَجَسّم فکری، تصّور کردن، Visualization.

**ویلایەتی خەمسە:** واتە پارێزگای زەنگان کە ئەکەوێتە رۆژهەڵاتی پارێزگای ئازەربایجانی بەناو ئێران. ئەم شارە ئەردەشیری پاپەکانی پادشای ساسانی دروستی کردووە. ئێژن ئەشکەوتی کەرەفتووی سەقز تا زەنگان درێژەی هەیە و ئەگەر تا کۆتایی ئەشکەوتەکە برۆیت، گوێت لە تەقەی چەکوشی ئاسنگەرەکانی زەنگان ئەبێ؛ تیانەی مس و چەقۆی زەنگان بەناوبانگە. لە فارسیدا بەعەرەب کراوی وشەکە واتە زەنجان بەکار ئەبرێ، بەڵام لە کوردیدا هێشتاش هەمان زەنگانە کە وشەیەکی کوردی و بە واتای بەهدین یان پەیڕەوانی پەرتووکی زەندە. کۆتایی سەردەمی قاجار کە خێڵی خەمسە لەوێ نیشتەجێ کران ناوی ویلایەتی خەمسەی لەسەر دانرا. سەردەمی ناسرەدین شا، ویلایەتی خەمسە یەکێک بوو لە بیست و سێ ویلایەتی حکوومەتی قاجار. سەردەمی کۆماری کوردستان و ئازەربایجان، بە گوێرەی ئەوەی ژمارەیەکی زۆری ئازەری لێ نیشتەجێ کراوە، زەنگان لەگەڵ ئازەربایجان دانرابوو.



**هاوسێ:** هاونسێ، جیرانی لە تەنیشتەوە؛ هاوسێ و دراوسێ: جیرانی تەنیشت و جیرانی بەرامبەر.

**هاوڵاوی:** کەسێکە شوێنی نەخۆشی هاوڵە بە دەموچاویەوە مابێ.

**هۆبە:** جێی چەند رەشماڵ پێکەوە.

**هۆقە:** دەفری گچکەی گۆزەڵەئاسا، ئەو دەفرە گچکەیەی وافووری تریاک کێشان کە تریاکەکەی ئەخەنەسەر.

**هۆگر:** دەسکی دواوەوەی هەوجاڕ.

**هۆنە:** تەون ف بافت، نسیج.

**هومایی:** جاو، مۆری، کوتاڵی سپی چەرچەف.

**هەتوان:** مەرهەم، مەڵحەم.

**هەدا:** ئوقرە، ئارام، سەکنین؛ پێکەوە.

**هەرداندن:** توورەکردن، سڵ کردن.

**هەردەبیر:** وازوازی.

**هەردەگێڵ:** چۆڵگەرد، بیابانگەرد، مەردمی ئاوارە کە بدا بە کێودا.

**هەردەمی:** وازوازی.

**هەردین:** قەڵس بوون.

**هەرزاڵە:** سەکۆی لە گڵ یان دار بۆ کەلوپەل لەسە دانان، پێرک، ستێر.

**هەزبێ:** هەزوێ، جاترە.

**هەلەک:** نیو جەغز، زر.

**هەڵترووشکان:** چیچکان، قنچکان.

**هەڵئەمسا:** لە هەڵمسان، ئاوسان و پەنەمیان، باکردن، هەڵتۆقین.

**هەڵەت:** زورگ، زورب، زەوی و چاڵ و بەرز، زنجیرە تەپۆڵکە ف ماهور.

**هەڵەوەر:** زۆربڵێی دەمپیس، دەستەپاچە.

**هەمبەر:** بەرامبەر.

**هەنجار:** هەموار، ڕێک؛ شێوە، ڕەوت.

**هەورەبان:** کۆمانج، ژووری هەرە بەرزی باڵەخانە.

**هەوڵ:** وڕ، گێژ و سەرسام.

**هەوێشخان:** ژووری پشتەوە، ژووری بنەوە کە وەک هەمار یان چێشتخانە بەکار ئەهێنرێ.

**هەیتە:** سیخوڕ لە بەرگی دگەردا.

**هەیدە:** شکۆدار، شکۆمەند، فەرەوەر، مایەی شانازی ع فاخر.

**هێدمەگرتن:** سەرسووڕمان، سەرسام بوون، داچڵەکان.

**هێز:** بەشێ لە لەشکر لە هەزار کەس کەمتر نەبێ.

**هیس:** قورم، دووکەڵی چڕی نیشتوو.

**هیزە:** کووپە، دەبە.

**هیلال:** مانگیلە، هەیڤک، مەنگی چەن شەوە، نیو جەغز، کەوانی.

**هیم:** خیم، بنەڕەت، بناغە، بنەما.

**هێمان:** هێشتا.



**یابوو:** بارگین، ئەسپی نانەجیبی بارکێشان؛ بریتی لە پیاوی نەزانی تەمەڵ.

**یارەمەز:** جلف و لووسکە.

**یافت:** شوێنەوار، شۆپ.

**یاقووبی مسگەر:** یاقووبی کوڕی لەیسی مسگەر، لە پادشاکانی سەفاری بوو، لە سەدەی نۆی زاینی لە سیستان و خوراسان و تەبەرستان. ماوەیەکی دوور و درێژ دژی خەڵیفەکانی عەباسی شەری کرد. فارس بە باوکی زمانی فارسی لە پاش هێرشی عەرەب ناوی ئەبەن و تاجێک و ئەفغان بە باوکی زمانی دەری!

**یخ دان؛** خەواندنی وشتر، خیا.

**یەختەرمە:** یەدەک. ئەسپی زیادە سوار بە

دوای خۆیدا رای ئەکێشێ.

**یەغدان:** باوڵ، مجری تەختەی گەورەی رازاوە بە رووکەشی زەڕی بۆ هەڵگرتنی جلوبەرگ و شمەکی گرانبایی.

**یەغڵاوی:** قاپی دەسکداری بن مەتارەی سەربازی کە دەسکەکەی ئەکێشێتەوە و چێشتی تیا ئەخۆن.

**یەک لۆ:** لەڕ، لاواز، باریکەڵە.